٣- شوێنی جوڵەو کارو فرمان دیاری دەکات:

| Runa nerede yaşıyor?<br>ڕوونە لە کوێ دەژیت؟ | Runa Erbil'de yaşıyor.<br>ڕوونە لە هەولێر دەژیت. |
|---|---|
| Sen nerede kalıyorsun?<br>تۆ لەکوێ دەمێنیتەوە؟ | Ben yurtta kalıyorum.<br>من لە بەشەناوەخۆیی دەمێنمەوە. |
| Gökhan kimde kalıyor?<br>گۆکهان لای کێ دەمێنێتەوە؟ | Gökhan bende kalıyor.<br>کەلوپەلەکانم لای پورمە. |
| Annen nerede yemek yiyor?<br>دایکت لە کوێ نان دەخوات؟ | Annem evde yemek yiyor.<br>دایکم لەماڵەوە نان دەخوات. |
| Ali nerede çalışıyor?<br>عەلی لەکوێ کار دەکات؟ | Ali fabrikada çalışıyor.<br>عەلی لە کارگە کار دەکات. |

٤- کات و ساتی ئیش و کار دیاری دەکات، وەك ساڵ و وەرز و مانگ و ڕۆژ و...

| Bayram**da** buluşalım. | با لە جەژندا یەکتر ببینین. |
|---|---|
| Yaz tatilin**de** çalışıyorum. | لە پشووی هاویندا کار دەکەم. |
| Randevumuz saat beş'**te**. | مەوعیدەکەمان کاتژمێر پێنجە. |
| Saat üç buçuk**ta** oynuyoruz. | کاتژمێر سێو نیو یاری دەکەین. |
| Eylül'**de** doğdum. | لە مانگی ئەیلولدا لەدایك بوومە. |
| Biz ٢٠١٠'**da** İstanbul'a gittik. | ئێمە لە ٢٠١٠ چووینە ئیستەنبوڵ. |

٥- لە ڕستەی هەیە و نیە (Var) و (Yok) دا هەمیشە پاشگری هەبوون -da/-de/-ta/-te بەکار دێت:

| Kim**de** para var? | کێ پارەی لەلا هەیە؟ |
|---|---|

| Ağaç**ta** kuşlar var. | لەسەر دارەکە باڵندە هەن. |
|---|---|
| Ben**de** hiç bilet yok. | من هیچ بلیتم لەلا نیە. |
| Biz**de** sorun yok. | ئێمە کێشەمان نیە. |
| Kayseri'**de** ırmak var mı? | لە قەیسەری ڕووبار هەیە؟ |
| Siz**de** yetenek var. | ئێوە بەهرەتان هەیە. |

تێبینی:

١- هەرکات لە ناوێکدا جێناوی خاوەندارێتی(İyelik eki) و پاشگری حاڵی بەیەکەوە هاتن ئەوا **سەرەتا جێناوی خاوەندارێتی پاشان پاشگری حاڵی** دادەنرێت.

- Aile-**miz-de** beş kişi var.
- Kafa-**m-da** ilginç fikirler var.
- Sizin ülke-**niz-de** savaş var.

٢- لە هەردوو کەسی سێیەمی تاك و کۆدا (**O/Onlar**) کاتێ جێناوی خاوەندارێتی(İyelik eki) و پاشگری Bulunma hali بەکارهاتن، ئەوا **پیتی (N) وەك ناوبڕ لەنێوانیان دادەنرێت**.

Çanta-sı-**n**-da / Çanta-ları-**n**-da / Para-sı-**n**-da / Para-ları-**n**-da / Ev-i-**n**-de / Ev-leri-**n**-de

- Onun ev**inde** kuş var.
- Ahmet'in çanta**sında** neler ver?
- Onların arabalar**ında** çocuk var.

## • چوارەم/ حاڵەتی جیابوونەوە (Ayrılma Hali):

لەم حاڵەتەدا ناو پاشگری (**-dan/-den/-tan/-ten**) وەردەگرێ. بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی دووانەیی و یاسای فستقچی شەهاب. ئەم پاشگرەش **بە مانای (لە...وە) (مِن) دێت**. لەکاتی جیابوونەوەو جێهێشتنی شوێنێك، کەسێك، شتێك، یان وەرگرتن لەسەرچاوەیەکەوە، هاتن لە شوێنێکەوە...هتد بەکار دەهێنرێت. بەگشتی خاڵی دەست پێکردن و سەرچاوەی دەستپێکی کارەکە نیشان دەدات و وەڵامی ئەو سێ پرسیارە دەداتەوە:

| شێوازەکانی دەرکەوتنی Ayrılma hali | |
|---|---|
| a , ı , o , u | -dan |
| e , i , ö , ü | -den |
| a , ı , o , u + Fstkçşhp | -tan |
| e , i , ö , ü + Fstkçşhp | -ten |

| Nereden? | لە کوێوە؟ |
|---|---|
| Kimden? | لای کێوە؟ |
| Neyden? | لەچیەوە؟ |

| Oku**dan** | لە قوتابخانەوە | Sınıf**tan** | لە پۆلەوە |
|---|---|---|---|
| Baba**dan** | لە باوکەوە | Kitap**tan** | لە کتێبەوە |
| Çanta**dan** | لە جانتاوە | Bağdat'**tan** | لە بەغداوە |
| Erbil'**den** | لە هەولێرەوە | Otobüs**ten** | لە پاسەوە |
| Ben**den** | لە منەوە | Polis**ten** | لای پۆلیسەوە |
| Ev**den** | لەماڵەوە | Ahmet'**ten** | لای ئەحمەدەوە |

- **حاڵەتەکانی بەکارهێنانی** پاشگری جیابوونەوە (Ayrılma hali)

١- سەرچاوەی جووڵە و خاڵی دەسپێکردنی جووڵەو کار نیشان دەدات:

| | |
|---|---|
| Babam Erbil'**den** geliyor. | باوکم لە هەولێرەوە دێت. |
| Aso yurt**tan** çıkıyor. | ئاسۆ لە بەشەناوەخۆیی دەردەچێ. |
| Ali'**den** para istiyorum. | پارەم لە عەلی دەوێت. |
| Çanta**dan** kitap alıyor. | لەجانتاوە کتێب دەردێنێ. |
| Kitap**tan** öğreniyorum. | لە کتێبەوە فێر دەبم. |

٢- کاتێ شتێك لە کۆمەڵەکەی خۆی جیا دەبێتەوە، لەنێو کۆمەڵەیەکی زۆر شتێك جیابێتەوە.

| | |
|---|---|
| Bu pasta**dan** bir parça yedim. | پارچەیەکم لەو کێکە خوراد. |
| Bu gömlekler**den** alıyorum. | لەو کراسانە دەیکڕم. |
| Grup**tan** biri geldi. | یەکێك لە گرۆپەکەوە هات. |
| Kırmızı güller**den** istiyorum. | لە گوڵە سوورەکانم دەوێت. |
| Eski eşyalar**dan** satıyor musun? | لە کەلوپەلە کۆنەکانە دەفرۆشی؟ |

تێبینی: لەو بەکار هێنانەدا زۆربەی کات فرمانەکانی (**al-/sat-/iste-**) بەکاردێت.

٣- نیشاندانی هۆکاری بارودۆخێك:

| | |
|---|---|
| Ağaç susuzluk**tan** kuruyor. | دارەکە لە بێ ئاویان ووشك دەبێ. |
| Aynur soğuk**tan** hasta oluyor. | ئاینور لە سەرما نەخۆش دەکەوێ. |
| Açlık**tan** ölüyor. | لەبرسان دەمرێ. |
| Sen**den** bıktım. | لەتۆ بێزار بووم. |
| Mutluluk**tan** uçuyorum. | لە خۆشیا دەفڕم. |

٤- نیشاندانی هۆکاری جووڵەو فرمانێك:

| | |
|---|---|
| Düşünmek**ten** başım ağrıyor. | سەرم دێشێ ئەوەندەی بیر بکەمەوە. |
| Çok çalışmak**tan** hastalandım. | نەخۆش کەوتم ئەوەندەی کار بکەم. |
| Yürümek**ten** ayaklarım ağrıyor. | قاچم دێشێ ئەوەندەی بڕۆم. |

تێبینی:

١- هەرکات لەناوێکدا جێناوی خاوەندارێتی(İyelik eki) و پاشگری حاڵی بەیەکەوە هاتن ئەوا **سەرەتا جێناوی خاوەندارێتی پاشان پاشگری حاڵی دادەنرێت**.

Benim ev-**im-den**.
Senin el-**in-den**.
Onun kalb-**i**-n-**den**.
Bizim araba**-mız-dan**.
Sizin kitab**-ınız-dan.**
Onların cep-**leri**-n-**den**.

٢- لە هەردوو کەسی سێیەمی تاك و کۆدا (**O/Onlar**) کاتێ جێناوی خاوەندارێتی و پاشگری Ayrılma بەیەکەوە بەکارهاتن، ئەوا **پیتی (N) وەك ناوبڕ لەنێوانیان دادەنرێت**.

Çanta-sı-**n**-dan / Çanta-ları-**n**-dan / Para-sı-**n**-dan / Para-ları-**n**-dan / Ev-i-**n**-den / Ev-leri-**n**-den.

- پێنجەم/ حاڵەتی ڕوون کردنەوە (Belirtme Hali):

ئەم حاڵەتە **بۆ پیشاندان و ڕوون کردنەوەیە**، ئەگەر ئەو شتەی ئاماژەی پێ دەکرێ ناسراوبێت لەلایەن قسەکەرەوە ئەوکاتە ئەو پاشگرە وەردەگرێ، یان شتێك کە لە نزیکەوە بێت و ئاماژەی پێ بدەی و نیشانی بدەی.

پاشگری ئەم حاڵەتەش بریتیە لە (**-ı/-i/-u/-ü**) بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی. **لە ڕووی ماناوە ئەو پاشگرە شتێکی تایبەتە بە زمانی تورکی، بۆیە کەسانی بیانی لە سەرەتای فێربوونی زمانی تورکیدا کێشەیان لە بەکارهێنانیدا بۆ دروست دەبێت.** چارەسەر بوونیشی پێویستی بە خوێندنەوەو تێگەیشتن هەیە و **بەتێپەڕبوونی کات قوتابی دەتوانێ بە دروستی بەکاری بێنێ.** ئەگەر مانای ئەم پاشگرە وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی دەتوانین بڵێین **هەندێ کات مانای پاشگری ناسراوی (ەکە) دەدات**، هەندێ جاریش لە شێوەزاری هەولێری شتێکی هاوشێوەمان هەیە بەکاری دێنین بۆ نمونە دەووترێ (پارەی بینە، نانی دەخۆم، گۆشتی دەکرم...) بەڵام بە دیاریکراوی لە ڕێزمانی کوردیدا شتێکمان نیە لەبەرامبەریدا. لەکاتی بەکارهێنانیشیدا دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە حاڵەتێکی تایبەتی زمانی تورکیە و پێویستە یاسا و حاڵەتەکانی بەکارهێنانی بزانین و بە مەنتقی زمانی کوردی بەراوردی نەکەین.

ئەم پاشگرە **تەنها لەگەڵ ئەو ڕستانە بەکاردێت کە فرمانەکەیان تێپەڕ(Geçişli Fiil)**ە، واتە ئەو فرمانەی کە پێویستی بە بەرکار(Nesne) هەیە تا مانای ڕستەکە تەواو بێت بۆ نمونە (Sen dergiyi okuyorsun) واتە (تۆ گۆڤارەکە دەخوێنیتەوە) لێرەدا فرمانی (خوێندنەوە) بەبێ بەرکاری (گۆڤار) مانا نادات، بۆیە بەو فرمانە دەڵێین فرمانی تێپەڕ. بەپێچەوانەوە پاشگری ڕوون کردنەوە هەرگیز لەگەڵ ئەو ڕستانە بەکار نایەت کە فرمانەکەیان تێنەپەڕ(Geçişsiz Fiil)ە، واتە ئەو فرمانەی پێویستی بە

بەرکار(Nesne) نیە بۆ تەواوبوونی ماناکەی بۆ نمونە (Çocuk uyuyor) واتە (منداڵەکە دەخەوێت) لێرەدا فرمانی (خەوتن) تێنەپەڕە.

(لە زمانی تورکیدا ناوەکان خۆیان لە بنچینەدا ناسراون، بۆ ئەوەی ببێتە نەناسراو پێویست بە پێشگری (bir) دەکات بۆ نمونە bir gömlek واتە کراسێك).

پاشگری حاڵی ڕوونکردنەوە(Belirtme hali) وەڵامی ئەو سێ پرسیارە دەداتەوە:

| شێوازەکانی دەرکەوتنی پاشگری Belirtme hali | |
|---|---|
| -ı | a , ı |
| -u | o , u |
| -i | e , i |
| -ü | ö , ü |

| | |
|---|---|
| کوێ؟ | Nereyi? |
| کێ؟ | Kimi? |
| چی؟ | Neyi? |

تێبینی:

١- پاشگرەکانی Belirtme hali **(-ı/-i/-u/-ü)** ئەگەر بچنە سەر ناوێك کە کۆتایی هاتبێت بە پیتێکی دەنگی، ئەوا **پیتی (Y) وەك ناوبڕ لەنێوان ناوەکە و پاشگرەکە دادەنێین.**

| | |
|---|---|
| Kapı-y-**ı** | Defter-**i** |
| Kedi-y-**i** | Kitab-**ı** |
| Ütü-y-**ü** | Otobüs-ü |
| Depo-y-**u** | Top-**u** |

٢- لەهەردوو کەسایەتی سێیەمی تاك و کۆ (**O/Onlar**) کاتێ جێناوی خاوەندارێتی(İyelik eki) و پاشگری Belirtme بەیەکەوە بەکارهاتن، **ئەوا پیتی (N) وەك ناوبڕ لەنێوانیان دادەنرێت.**

Ülke-si-**n**-i / ülke-leri-**n**-i / kağıd-ı-**n**-ı / kağıt-ları-**n**-ı / güc-ü-**n**-ü / güç-leri-**n**-i

٣- کاتێ لە ناوێکدا جێناوی خاوەندارێتی(iyelik eki) و پاشگری Belirtme بەیەکەوە بەکاردێن، ئەوا **سەرەتا جێناوی خاوەندارێتی و پاشان پاشگری حاڵی دێت**.

| Benim araba-**m-ı** | Benim kitab-**ım-ı** |
|---|---|
| Senin araba-**n-ı** | Senin kitab-**ın-ı** |
| Onun araba-**sı**-n-ı | Onun kitab-**ı**-n-ı |
| Bizim araba-**mız-ı** | Bizim kitab-**ımız-ı** |
| Sizin araba-**nız-ı** | Sizin kitab-**ınız-ı** |
| Onların araba-**ları**-n-ı | Onların kitap-**ları**-n-ı |

- **حاڵەتەکانی بەکارهێنانی** پاشگری ڕوون کردنەوە Belirtme hali (-ı/-i/-u/-ü):

پاشگری حاڵی ڕوون کردنەوە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو شتە، ئەو کەسە، ئەو بەرکارە بەکاردێت کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری فرمانی ڕستەکە (واتە فرمانەکە کار لەو شتە دەکات)، هەروەها **ئەو بەرکارەی کە پاشگری حاڵی Belirtme چووەتە سەر دەبێتە شتێکی ناسراو** و زانراو لەلایەن هەر دوو کەسی قسەکەر و گوێگر.

| Bir araba aldım.(belirsiz)<br>ئۆتۆمبێلێکم کڕی. | Arabay**ı** satıyorum. (belirli)<br>ئۆتۆمبێلەکە دەفرۆشم. |
|---|---|
| Bir ev boyuyor.(belirsiz)<br>خانوویەك بۆیە دەکات. | Evim**i** boyuyorum. (belirli)<br>خانووەکەم بۆیە دەکەم. |
| Parası bitiyor.(belirsiz)<br>پارەکەی تەواو دەبێت. | Parasın**ı** harcıyor. (belirli)<br>پارەکەی خەرج دەکات. |

**١- هەرکاتێك جێناوەکانی ئاماژە (bu/şu/o) هاتن ئـەوا بـەرەهایی دەبـێ بـەرکاری ڕستەکە پاشگری Belirtme hali بخرێتەسەر**. ئەگەر جێنـاوە ئاماژەکـە خـۆی ببێتـە بەرکار ئەوا خۆی ئەو پاشگرە وەردەگرێت، چونکە هەبوونی جێناوی ئاماژە واتـە شـتەکە ناسراو و زانراوە لای قسەکەر و گوێگر.

| | |
|---|---|
| Bun**u** istiyor musun? | ئەوەت دەوێت؟ |
| Bu arabay**ı** alıyorum. | ئەو ئۆتۆمبێلە دەکڕم. |
| Şu kalem**i** bana vermiyor musun? | ئەو پێنووسە نادەی بەمن؟ |
| Bunlar**ı** yemiyoruz. | ئەوانە ناخۆین. |
| Şunlar**ı** sana veriyorum. | ئەوانە دەدەم بە تۆ. |
| On**u** hiç sevmiyorum. | ئەوم هیچ خۆش ناوێت. |

**٢- هەر ناوێك جێناوی خاوەندارێتی(iyelik eki) وەرگرت ئەوا پاشگری Belirtme hali ش وەردەگرێت**، چونکە ناو بەهۆی جێناوی خاوەندارێتیەوە دەبێتە شتێکی ناسراو.

| | |
|---|---|
| Ben kardeşim**i** uyutuyorum. | من براکەم دەخەوێنم. |
| Sen aylen**i** özlüyor musun? | تۆ بیری خێزانەکەت دەکەیت؟ |
| Runa babasın**ı** seviyor. | ڕوونە باوکی خۆش دەوێت. |
| Odamız**ı** temizliyoruz. | ژوورەکەمان پاك دەکەینەوە. |
| Arakadaşların**ı** bekliyorlar. | چاوەڕێی هاوڕێکەیان دەکەن. |
| Yüzüğüm**ü** kaybettim. | ئەنگوستیلەکەم بزر کرد. |
| Fikriniz**i** söylüyor musunuz? | بیرۆکەکەی خۆتان دەڵێن؟ |

٣- **ناوی تایبەتی کەس و شوێن و شت ناسراون** و پاشگری Belirtme hali وەردەگرن.

| | |
|---|---|
| Ben her gün babam’**ı** görüyorum. | من هەموو ڕۆژێك باوکم دەبینم. |
| Biz Duhok’**u** beğendik. | ئێمە دهۆکمان بەدڵ بوو. |
| Ömer Türkiye’y**i** geziyor. | عومەر گەشتی تورکیا دەکات. |
| Siz Ayşe’y**i** bekleyiniz. | ئێوە چاوەڕێی عائشە بکەن. |

٤- هەرکات ئەو **فرمانە تێپەڕانەی** خوارەوە لەڕستەدا هاتن ئەوا زۆربەی کات پاشگری Belirtme hali لەو ڕستەیەدا بەکار دێت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Sev- | İzle- | Gör- | Temizle- |
| Duy- | Sat- | Al- | Bekle- |
| Aç- | Dinle- | Kes- | Mutlu et- |
| Kulan- | Sil- | Boya- | Beğen- |
| De- | Öğret- | Öğren- | Ye- |
| İç- | Gönder- | Anla- | Tut- |
| Kabul et- | Özle- | Tamir et- | Oku- |

## • تەواوکردنی ناو (İsim Tamlaması)

تەواوکردنی ناوەکان(İsim Tamlaması) وەك ئامرازی دانـەپاڵی زمـانی کوردیـە و دەبێتە دوو بەشی سەرەکی:

### ١- **تەواوکردنی ناویی نادیار** (Belirtisiz İsim Tamlaması)

لەو حاڵەتەدا بەهۆی پاشگری تەواوکاریەوە **ناوەکان سیفەتێکی گشتی وەردەگرن** و تایبەت نابن بە کەسێك یان شتێك و لایەنێکی دیاری کراو، بەڵکو گشـتگیر دەبـێ بۆیەشـە پێـی دەڵێن نادیار بۆ نمونە (**دەرگای پۆل، بەڕێوەبەری قوتابخانە، پارەی عێراقی**...هتد).

**ناوی یەکەم پێی دەگووترێ (Tamlayan) و هیچ جۆرە پاشگرێکی ناچێتە سەر**، بەڵام **ناوی دووەم کە پێی دەگووترێ (Tamlanan) بـەپێی یاسـای هەماهـەنگی چـواریی پاشگری تەواوکاریی ( -ı/-u/-i/-ü ) وەردەگرێ**، خۆ ئەگەر ئەو پاشـگرانە بچـنە سـەر ناوێك کە کۆتایی هاتبێ بە پیتێکی دەنگی ئەوا **پیتی (S) وەك ناوبڕ** لـەنێوان ناوەکـە و پاشگرە تەواوکاریەکە دادەنرێ و دەبنە (**-sı/-su/-si/-sü**)، بەم شێوەیە:

| İsim (tamlayan) + İsim (tamlanan)<br>----------------- + -ı,-u,-i,-ü / -sı,-su,-si,-sü | | | |
|---|---|---|---|
| ی.هەماهەنگی دەنگی چواریی | تەواوکاریی tamlanan | نمونە | مانا |
| a , ı | -ı<br>-sı | Cumhur başkan**ı**<br>Ev kapı**sı** | سەرۆك کۆمار<br>دەرگای ماڵ |
| o , u | -u<br>-su | Irak pasaport**u**<br>Silah depo**su** | پاسەپۆرتی عێراقی<br>کۆگای چەك |
| e , i | -i<br>-si | Osmanlı devlet**i**<br>Göç idare**si** | دەوڵەتی عوسمانی<br>بەڕێوەبەرایەتی کۆچ |
| ö , ü | -ü<br>-sü | Okul müdür**ü**<br>İstanbul köprü**sü** | بەڕێوەبەری قوتابخانە<br>پردی ئیستەنبوڵ |

| نمونە لە ڕستەدا | |
|---|---|
| Diş fırça**sı** ne kadar? | فڵچەی ددان بەچەندە؟ |
| Sınıf kapı**sı** kırıldı. | دەرگای پۆل شکا. |
| Bir su şişe**si** alıyorum. | شوشەیەکی ئاو دەکڕم. |
| Burada güneş gözlüğ**ü** çok pahalı. | چاویلکەی دژەخۆر لێرە زۆر گرانە. |
| Bir çay bardağ**ı** getiriyorum. | بەرداخێکی چای دێنم. |
| Yatak oda**sı**nda yatıyorum. | لەژووری خەوتن پاڵ دەدەمەوە. |
| Türk lira**sı** düşüyor. | لیرەی تورکی دادەبەزێ. |

تێبینی: کاتێ پاشگری تەواوکاریی (Tamlanan) و پاشگری حاڵی بەیەکەوە هاتن **(N)** **وەك ناوبڕ لەنێوانیان دادەنرێ**.

| Göç daire-si-**n**-e | Kürt kültür-ü-**n**-de | Öğrenci belge-si-**n**-de |
|---|---|---|
| Bozuk para-sı-**n**-ı | Ev pencere-si-**n**-den | Irak toprağ-ı-**n**-da |

## ٢- تەواوکردنی ناویی دیاریکراو (Belirtili İsim Tamlaması)

لەو حاڵەتەدا ناوەکان **سیفەتێکی تایبەتی وەردەگرن** و تایبەت دەبن بە کەسێك یان شتێك و لایەنێکی دیاری کراو، بۆ نمونە (**دەرگای پۆلی دووەم، بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچان، وولاتی عەلی**...هتد).

لێرەدا **ناوی یەکەم پێی دەگووترێ(Tamlayan)** و **پاشگری تەواوکاریی (-ın/-un/-in/-ün) وەردەگرێ**، ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبێ بە پیتێکی دەنگی ئەوا **ناوبڕی (N)** لەنێوان ئەو پاشگرانە و ناوەکە دادەنرێ و دەبنە (**-nın/-nun/-nin/-nün**).

**ناوی دووەمیش پێی دەگووترێ (Tamlanan) پاشـگری تـەواوكاریی (ı/-u/-i/-ü-) وەردەگرێ**، ئەگەر ئەو پاشگرانە بچنە سەر ناوێك كە كۆتایی هاتبێ بـە پیتێكـی دەنگـی ئەوا **ناوبڕی (S)** لەنێوان ناوەكە و پاشگرە تەواوكاریەكـە دادەنـرێ و دەبنـە (**-sı/-su/-si/-sü**). هەمیشە پاشگرەكانی تەواوكەری ناویی دەبێ بە گوێرەی گونجان لەگەڵ یاسـای هەماهەنگی دەنگی چواریی دابنرێت.

| İsim (tamlayan) + İsim (tamlanan)<br>ın,un,in,ün / nın,nun,nin,nün + ı,u,i,ü / sı,su,si,sü | | | | |
|---|---|---|---|---|
| هەماهەنگی دەنگی | پاشگری tamlayan | پاشگری tamlanan | نموونە | مانا |
| a , ı | -ın / -nın | -ı / -sı | Babam**ın** baba**sı** | باوكی باوكم |
| o , u | -un / -nun | -u / -su | kuş**un** uçuş**u** | فڕینی باڵندە |
| e , i | -in / -nin | -i / -si | Ali'**nin** ülke**si** | وڵاتی عەلی |
| ö , ü | -ün / -nün | -ü / -sü | Müdür**ün** mühr**ü** | مۆری بەڕێوەبەر |

تێبینی:

١- هەركاتێك پاشگری تەواوكاریی (Tamlanan) و پاشگرەكانی حاڵی بەیەكەوە هاتن، ئەوا **پیتی (N) وەك ناوبڕ لەنێوانیان دادەنرێ**.

| Babamın baba-sı-**n**-a |
|---|
| Müdürün mühr-ü-**n**-e |
| Bankanın belge-si-**n**-de |
| Kuşun uçuş-u-**n**-da |
| Uçağın pencere-si-**n**-den |
| Ülkemin toprağ-ı-**n**-ı |

٢- دەكرێ لە یەك ڕستەدا چەند جارێـك كـرداری تـەواوكاریی ناوەكـان وەك زنجیرەیـەك بەدوای یەكدا بێن. لەم حاڵەتەشدا ناوەكانی ناوەڕاست هەم پاشگری **Tamlayan** و هەم پاشگری **Tamlanan** وەردەگرن بەسەر یەكەوە، بەم شێوەیە:

| Sınıf**ın** kapı**sının** kol**u** bozuktur.<br>قۆڵی دەرگای پۆلەكە تێكچووە. |
|---|
| Diş fırça**sının** reng**i** çok güzel.<br>ڕەنگی فلچەی ددانەكە زۆر جوانە. |
| Ahmet'**in** gömleğ**inin** ceb**i** yırtılmıştır.<br>بەرِكی كراسەكەی ئەحمەد دڕاوە. |
| Bilgisayar**ın** klavye**sinin** ön tuşlar**ının** reng**i** çirkindir.<br>ڕەنگی دوگمەكانی پێشەوەی كیبۆردی كۆمپیوتەرەكە ناشیرینن. |

٣- دەشێ لەنێوان tamlanan و tamlayan دا ووشەی تریش هەبێت.

- Sınıf**ın** en uzun boylu**su** Aso'dur.
- Türkiye'**nin** en güzel şehr**i** Trabzon'dur.

٤- زۆر جاران لەكاتی نووسین و قسەكردندا بكەر **(Özne) لادەبردرێ و دەشـاردرێتەوە**، بەڵام بەگوێرەی پاشگرەكانی خاوەندارێتییەوە دەزانرێ كە بۆ كێ دەگەڕێتەوە.

| | |
|---|---|
| Onun gözleri mavidir. | Göz**leri** mavidir. |
| Benim arabam bozuktur. | Araba**m** bozuktur. |
| Bizim paramız yok. | Para**mız** yok. |
| Sizin görüşünüz iyidir. | Görüş**ünüz** iyidir. |

٥- تـــەواوکراوی ئامـــادە: کاتـــێ جێنـــاوی ســـەربەخۆ(Kişi Z.) و جێنـــاوی خاوەندارێتی(İyelik eki) بەیەکەوە کۆ دەبنەوە دەبنە تەواوکراوی ئامادەو **پێویست بـە پاشگرەکانی تەواوکاری ناکەن** و خۆیان تەواوکراوی دیاریکراون (belirtili).

| Benim vatanım | نیشتیمانی من |
|---|---|
| Senin vatanın | نیشتیمانی تۆ |
| Onun vatanı | نیشتیمانی ئەو |
| Bizim vatanımız | نیشتیمانی ئێمە |
| Sizin vatanınız | نیشتیمانی ئێوە |
| Onların vatanı / vatanları | نیشتیمانی ئەوان |

کـاتێ پاشـگرەکانی حـاڵی دەچـنە سـەر تـەواوکراوی ئامـادە بـۆ هـەردوو کەسـایەتی (**O/Onlar**) ئەوا **پیتـی (N) وەك نـاوبڕ** لـەنێوان پاشـگری حاڵیەکـەو تەواوکراوەکـە دادەنرێ.

- Onun vatan-ı-**n**-da
- Onların vatan-ları-**n**-da

## • ویستن و نەویستن (İstemek)

- ئەرێ (olumlu) ویستن:

| Fiil + -mAk + istiyor + şahıs eki | |
|---|---|
| Ben su içmek istiyorum | من دەمەوێت ئاو بخۆمەوە. |
| Sen ödev yapmak istiyorsun. | تۆ دەتەوێت ئەرکی ماڵەوە بکەیت. |
| O yemek yemek istiyor. | ئەو دەیەوێت نان بخوات. |
| Biz içeri girmek istiyoruz. | ئێمە دەمانەوێت بچینە ژوورەوە. |
| Siz konuşmak istiyorsunuz. | ئێوە دەتانەوێت قسە بکەن. |
| Onlar gezmek istiyorlar. | ئەوان دەیانەوێت بگەڕێن. |

- نەرێ (olumsuz) نەویستن:

| Fiil + -mAk + istemiyor + şahıs eki | |
|---|---|
| Ben su içmek istemiyorum. | من نامەوێت ئاو بخۆمەوە. |
| Sen doğru söylemek istemiyorsun. | تۆ ناتەوێ ڕاستی بڵێیت. |
| O para vermek istemiyor. | ئەو نایەوێ پارە بدات. |
| Biz yanlış anlamak istemiyoruz. | ئێمە نامانەوێت بەهەڵە تێ بگەین. |
| Siz yaya yürümek istemiyorsunuz. | ئێوە ناتانەوێت بەپێ بڕۆن. |
| Onlar şarkı söylemek istemiyorlar. | ئەوان نایانەوێت گۆرانی بڵێن. |

- **لەگەڵ (ile): بەچوار شێوازو مانای جۆراوجۆر بەکاردێت.**

١- بەمانای (وە) (ile)

| | |
|---|---|
| Runa **ile** Ayşe çok güzel. | ڕوونە و ئایشە زۆر جوانن. |
| Runa'y**la** Ayşe çok güzel. | ڕوونە و ئایشە زۆر جوانن. |
| Kapıy**la** duvar çok sert. | دەرگا و دیوار زۆر ڕەقن. |
| Su **ile** süt sıvıdır. | ئاو و شیر شلن. |
| Aso'y**la** Ali çok yakın arkadaştır. | ئاسۆ و عەلی هاوڕێی زۆر نزیکن. |
| Osman'**la** Ali geliyorlar. | عوسمان و عەلی دێن. |

٢- بەمانای (لەگەڵ) (beraber)

| | |
|---|---|
| Ali'**yle** Ömer pikniğe gidiyorlar. | عەلی لەگەڵ عومەر دەچنە سەیران. |
| Türkiye **ile** Irak anlaşma yapıyor. | تورکیا و عێراق ڕێککەوتنن دەکەن. |
| Eşimş**le** geliyorum. | لەگەڵ هاوسەرەکەم دێم. |

٣- بەمانای (بە) بۆ ئامرازی هاتووچۆ (taşıt,araç,vasite)

| | |
|---|---|
| Öğrenciler tramva**yla** okula geliyorlar. | قوتابیەکان بە ترامڤای دێنە قوتابخانە. |
| Çocuklar otobüs**le** gidiyorlar. | منداڵەکان بە پاس دەڕۆن. |
| Biskilet**le** geziyorum. | بە پایسکل دەگەڕێم. |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| Araba | ئۆتۆمبێل | Biskilet | پایسکل | Taksi | تاکسی |
| Tren | شەمەندەفەر | Otobüs | پاس | Tramvay | ترامڤای |
| Kamyon | کامیۆن | Uçak | فڕۆکە | Motor | ماتۆڕ |

٤- چۆنیەتی (Nasıl)، بەمانای (بە)

| | |
|---|---|
| Okula hız**la** geliyorum. | بەخێرایی دێمە قوتابخانە. |
| Acele**yle** bu işi yapıyorum. | بەپەلە ئەو کارە دەکەم. |
| Hayecan**la** seni bekliyorum. | بەبێ ئارامی چاوەڕێی تۆ دەکەم. |

تێبینی:

١- ئامرازی ile دەکرێ لەڕستەدا بە پێنج شێوە دەربکەوێ (ile/-la/-le/-yla/-yle).

| | |
|---|---|
| Ali ile | لەگەڵ عەلی |
| Murat'la | لەگەڵ موراد |
| Mehmet'le | لەگەڵ محمد |
| Aso'yla | لەگەڵ ئاسۆ |
| Ayşe'yle | لەگەڵ عائیشە |

٢- جێناوە کەسیەکان لەگەڵ ئامرازی (ile) زۆر بەکاردێن و بەم شێوازە دەبن.

| | |
|---|---|
| Benimle | لەگەڵ من |
| Seninle | لەگەڵ تۆ |
| Onunla | لەگەڵ ئەو |
| Bizimle | لەگەڵ ئێمە |
| Sizinle | لەگەڵ ئێوە |
| Onlarla | لەگەڵ ئەوان |

- وولاَت، میللەت، زمان (ülke, millet, dil)

- بۆ دانەپاڵ وولاَت یان پرسیارکردن دەربارەی (**خەڵکی کوێیی؟**) (Nerelisin?) پاشگری (**-li/-lı/-lü/-lu**) بەکاردێت.

- بۆ میللەت هیچ پاشگرێك نیە.

- بۆ **زمان** پاشگری (**-ca/-ce/-ça/-çe**) بەگوێرەی هەردوو یاسای هەماهەنگی دەنگی دووانەیی و فستقچی شەهاب بەکاردێت.

| **Ülke**<br>**وولاَت** | **Nereli**<br>**کوێیی** | **Milliyet**<br>**میللەت** | **Dil**<br>**زمان** |
|---|---|---|---|
| Irak<br>عێراق | Iraklı<br>عێراقی | Arap<br>عەرەب | Arapça<br>عەرەبی |
| Suriye<br>سوریا | Suriyeli<br>سوریی | Arap<br>عەرەب | Arapça<br>عەرەبی |
| Türkiye<br>تورکیا | Türkiyeli<br>تورکیایی | Türk<br>تورك | Türkçe<br>تورکی |
| Almanya<br>ئەڵمانیا | Almanyalı<br>ئەڵمانی | Alman<br>ئەڵمان | Almanca<br>ئەڵمانی |
| Ingiltere<br>ئینگلتەڕا | Ingiltereli<br>بەریتانی | Ingiliz<br>ئینگلیز | Ingilizce<br>ئینگلیزی |
| Ürdün<br>ئوردن | Ürdünlü<br>ئوردنی | Arap<br>عەرەب | Arapça<br>عەرەبی |
| Kürdistan<br>کوردستان | Kürdistanlı<br>کوردستانی | Kürt<br>کورد | Kürtçe<br>کوردی |
| Amerika<br>ئەمەریکا | Amerikalı<br>ئەمەریکی | Ingiliz<br>ئینگلیز | Ingilizce<br>ئینگلیزی |

- **پاشگرەکانی (-LI)(-sIz)(-LIk)(-CI):**

- **بۆ دروست کردنی سیفاتی ئەرێ** لە ناوەکان پاشگرەکانی (**-lı/-li/-lu/-lü**) بەکاردێت بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی.

- **بۆ دروست کردنی سیفاتی نەرێ** لە ناوەکان پاشگرەکانی (**-sız/-siz/-suz/-süz**) بەکاردێت بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی.

| ناو | سیفاتی ئەرێ lI | مانا | سیفاتی نەرێ sIz | مانا |
|---|---|---|---|---|
| Şeker | Şekerli | شەکراوی | Şekersiz | بێ شەکر |
| Acı | Acılı | تیژ / تاڵ | Acısız | ناتیژ / ناتاڵ |
| Tuz | Tuzlu | سوێر(خوێاوی) | Tuzsuz | بێ خوێ |
| Sabır | Sabırlı | بەئارام | Sabırsız | بێ ئارام |
| Sınır | Sınırlı | سنووردار | Sınırsız | بی سنوور |
| Para | Paralı | بەپارە | Parasız | بێ پارە |
| Edep | Edepli | بە ئەدەب | Edepsiz | بێ ئەدەب |
| Ahlak | Ahlaklı | بەڕەوشت | Ahlaksız | بێ ڕەوشت |
| Saygı | Saygılı | بەڕێز | Saygısız | بێ ڕێز |

تێبینی: ئەم پاشگرانە تەنها دەچنە سەر ناو و دەیکەنە سیفات، بەهیچ شێوەیەك ناچنە سەر فرمان.

- پاشگری (**-lık/-lik/-luk/-lük**) دەچێتە سەر ناو، **بۆ ناوی کەل و پەل و پیشە بەکاردێت**، ئەمەش بەگوێرەی گونجان لەگەڵ یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی، دوای چوونە سەری ئەم پاشگرەش هەر بە ناو دەمێننەوەو نابنە سیفات.

| Eşya adı | مانا | Meslek adı | مانا |
|---|---|---|---|
| Şekerlik | شەکردان | Öğretmenlik | مامۆستایەتی |
| Tuzluk | خوێدان | Öğrencilik | قوتابیەتی |
| Ekmeklik | nاندین | Doktorluk | دکتۆرێتی |
| Kalemlik | قەلەمدان | Gazetecilik | ڕۆژنامەڤانی |
| Çaydanlık | چایدان(کتری) | Avukatlık | پارێزەرێتی |
| Çöplük | زبڵدان | Mühendislik | ئەندازیارێتی |
| Kitaplık | پەرتووك خانە | Kuaförlük | سالۆنچێتی |

- پاشگری (**-cı/-ci/-cu/-cü/-çı/-çi/-çu/-çü**) بەگوێرەی گونجان لەگەڵ هەردوو یاسای هەماهەنگی دەنگی چوارییی و یاسای فستقچی شەهاب دەچێتە سەر ناو و بۆ دروست کردنی **ناوی پیشە** بەکاردێت.

| | | |
|---|---|---|
| -ci | Tamirci | چاککەرەوە |
| -cı | Zurnacı | زوڕناژەن |
| -cu | Fotbolcu | یاریزانی تۆپی پێ |
| -cü | Gözcü | چاودێر |
| -çı | Kitapçı | کتێب فرۆش |
| -çi | Işçi | کرێکار |
| -çu | Topçu | تۆپ هاوێژ |
| -çü | Gözlükçü | چاویلکەساز |

## • بەروار و کاتژمێر (Tarih ve Saat):

**١- بەروار** (Tarih): دەتوانین بە دوو شێواز بەروار دەربڕین وەك لە لیستەکەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە.

- **شێوازی یەکەم** زۆر سادەو ئاسانە، سەرەتا بەرواری ڕۆژەکە و پاشان ناوی مانگەکە دەگووترێت بەبێ هیچ پاشگر و پێشگرێك.

- **لەشێوازی دووەمدا** پێویستە سەرەتا ناوی مانگەکە، پاشان بەرواری ڕۆژەکە بگوترێت و یاسای تەواوکردنی ناویی دیاریکراو (Belirtili isim tamlaması) لەسەریان جێ بەجێ بکرێت.

| Bugün ayın kaçı? | ئەمڕۆ چەندی مانگە؟ |
|---|---|
| Ne zaman? Hangi gün? | چ کاتێك؟ کەی؟ چ ڕۆژێك؟ |
| Bugün ١٥ Eylül. | ئەمڕۆ پانزەی ئەیلولە. |
| Bugün Eylül’ün ١٥’i. | ئەمڕۆ پانزەی ئەیلولە. |
| ٢٠ Aralık’ta sınavımız var. | لە بیستی دێسەمبەر تاقیکردنەوەمان هەیە. |
| Aralık’ın ٢٠’sinde sınavımız var. | لە بیستی دێسەمبەر تاقیکردنەوەمان هەیە. |
| ٦ Şubat’ta dönüyorum. | لە شەشی شوبات دەگەڕێمەوە. |
| Temmüz’ün ١٣’ü gidiyoruz. | لە سێزدەی تەمموز دەڕۆین. |

| Yüzyıl | سەدە | Yıl | ساڵ |
|---|---|---|---|
| Ay | مانگ | Hafta | هەفتە |
| Mevsim | وەرز | Gün | ڕۆژ |
| Saat | کاتژمێر | Dakika | خولەك |
| Saniye | چرکە | Salise | ١/٦٠چرکە |
| Analog saati | کاتژمێری میکانیکی | Dijital saati | کاتژمێری ئەلیکترۆنی |

٢- **کاتژمێر** (Saat): لەزمانی تورکیدا چۆنیەتی دەربڕینی کاتژمێر دەبێتە دووبەشی سەرەکی:

| Saat kaç? | کاتژمێر چەندە؟ |
|---|---|
| Saat kaçta? | لە کاتژمێر چەند؟ |

A/ **کاتژمێر چەندە؟** (Saat kaç?): بۆ پرسیار کردن دەربارەی کاتژمێرە، ئەمەش سێ جۆری هەیە:

١- کاتژمێری تەواو و نیوە.

٢- خولەکی تێپەڕیوو (geçiyor).

٣- خولەك مان (var).

١- **کاتژمێری (تەواو) و (نیوە) هیچ پاشگرو پێشگرێکی لەگەڵ دانانرێت** (ئەگەر بویسترێت دەربڕینێکی جوانتر و فەرمیتری هەبێت ئەوا پاشگری DIr- دەخەینە سەر، خۆ ئەگەر نەشیخەینە سەر هەر دروستە).

| Saat kaç? کاتژمێر چەندە؟ | | |
|---|---|---|
| ٠١:٠٠ | Saat bir / birdir | کاتژمێر یەکە |
| ٠٥:٠٠ | Saat beş / beştir | کاتژمێر پێنجە |
| ٠٩:٠٠ | Saat dokuz | کاتژمێر نۆیە |
| ١٢:٠٠ | Saat on iki | کاتژمێر دووانزەیە |
| ٠٢:٣٠ | Saat iki buçuk | کاتژمێر دوو و نیوە |
| ٠٤:٣٠ | Saat dört buçuk | کاتژمێر چوار و نیوە |

| ٠٨:٣٠ | Saat sekiz buçuk | کاتژمێر هەشت و نیوە |
|---|---|---|
| ١١:٣٠ | Saat on bir buçuk | کاتژمێر یانزەو نیوە |

تێبینی: کاتژمێر ١٢:٣٠ حاڵەتێکی شازە، دەتوانین لەجیاتی بڵێین کاتژمێر دوانـزەو نیـوە (Saat on iki buçuk) بڵێین کاتژمێر نیوە (Saat yarım).

٢- **خولەکی تێپەڕیوو** (Geçiyor): بۆ تێپەڕینی خولەك بەسەر کاتژمێری تەواو لەنێوان (١ تا ٢٩ خولەك)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە دەردەبڕدرێت:

| **Tam saat + (y) -ı/-i/-u/-ü + ١-٢٩ + geçiyor** |
|---|

| Saat kaç? کاتژمێر چەندە؟ | |
|---|---|
| ٠١:٠٥ | Saat biri beş geçiyor. |
| ٠٢:١٠ | Saat ikiyi on geçiyor. |
| ٠٣:١٥ | Saat üçü on beş/çeyrek geçiyor. |
| ٠٥:١٩ | Saat beşi on dokuz geçiyor. |
| ٠٧:٢٠ | Saat yediyi yirmi geçiyor. |
| ٠٩:٢٣ | Saat dokuzu yirmi üç geçiyor. |
| ١٠:٢٥ | Saat onu yirmi beş geçiyor. |
| ١١:٢٧ | Saat on biri yirmi yedi geçiyor. |
| ١٢:٢٩ | Saat on ikiyi yirmi dokuz geçiyor. |

تێبینی: دەتوانین لەجیاتی پانزە خولەك (on beş dakika) ووشەی چـارەگ (çeyrek) بەکاربێنین.

٣- **خولەك مان** (Var): بۆ مانی چەند خولەکێك بۆ کاتژمێری تەواو لەنێوان (**٣١ تا ٥٩** خولەك)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە دەردەبڕدرێت:

**Tam saat + (y) -a/-e + ١-٢٩ + var**

| Saat kaç? کاتژمێر چەندە؟ | |
|---|---|
| ٠١:٣٣ | Saat ikiye yirmi yedi var. |
| ٠٢:٣٥ | Saat üçe yirmi beş var. |
| ٠٣:٤٠ | Saat dörde yirmi var. |
| ٠٥:٤٥ | Saat altıya on beş / çeyrek var. |
| ٠٧:٤٧ | Saat sekize on üç var. |
| ٠٩:٥٠ | Saat ona on var. |
| ١٠:٥١ | Saat on bire dokuz var. |
| ١١:٥٥ | Saat on ikiye beş var. |
| ١٢:٥٩ | Saat bire bir var. |

B/ **لەکاتژمێر چەند؟** (Saat kaçta?): بۆ پرسیار کردن دەربارەی بەرواری کات و ساتی دەست پێکردن یان کۆتایی هاتن...هتد کارێکە، ئەمەش سێ جۆری هەیە:

١- کاتژمێری تەواو و نیو.

٢- خولەکی تێپەڕیوو (geçe).

٣- خولەك مان (kala).

١- **کاتژمێری (تەواو) و (نیو):** بەهەمان شێوەی کاتژمێری تەواو و نیوی سەرەوەیە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە کۆتاییدا پاشگری (لە)(**-da/-de/-ta/-te**) زیاد دەکەین.

| Saat kaçta döneceksin? کاتژمێر چەند دەگەڕێیتەوە؟ | |
|---|---|
| ٠١:٠٠ | Saat birde döneceğim. |
| ١٢:٠٠ | Saat on ikide döneceğim. |
| ٠٢:٣٠ | Saat iki buçukta döneceğim. |
| ٠٨:٣٠ | Saat sekiz buçukta döneceğim. |

٢- **خولەکی تێپەڕیوو** (Geçe): بۆ تێپەڕینی خولەك بەسەر کاتژمێری تەواو لەنێوان (١ تا ٢٩ خولەك)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە دەردەبڕدرێت:

| **Tam saat + (y) -ı/-i/-u/-ü + ١-٢٩ + geçe + fiil** |
|---|

| Saat kaçta gidiyor? کاتژمێر چەند دەڕوات؟ | |
|---|---|
| ٠١:٠٥ | Saat biri beş geçe gidiyor. |
| ٠٢:١٠ | Saat ikiyi on geçe gidiyor. |
| ٠٣:١٥ | Saat üçü on beş/çeyrek geçe gidiyor. |
| ٠٧:٢٠ | Saat yediyi yirmi geçe gidiyor. |
| ٠٩:٢٣ | Saat dokuzu yirmi üç geçe gidiyor. |
| ١٠:٢٥ | Saat onu yirmi beş geçe gidiyor. |
| ١١:٢٧ | Saat on biri yirmi yedi geçe gidiyor. |

٣- **خولەك مان** (kala): بۆ مانی چەند خولەکێك بۆ کاتژمێری تەواو لەنێوان (٣١ تا ٥٩ خولەك)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە دەردەبڕدرێت:

| **Tam saat + (y) -a/-e + ١-٢٩ + kala + fiil** |
|---|

| Saat kaçta çıkıyor? کاتژمێر چەند دەردەچێ؟ | |
|---|---|
| ٠٢:٣٥ | Saat üçe yirmi beş kala çıkıyor. |
| ٠٣:٤٠ | Saat dörde yirmi kala çıkıyor. |
| ٠٥:٤٥ | Saat altıya çeyrek kala çıkıyor. |
| ٠٧:٤٧ | Saat sekize on üç kala çıkıyor. |
| ٠٩:٥٠ | Saat ona on kala çıkıyor. |
| ١٠:٥١ | Saat on bire dokuz kala çıkıyor. |
| ١١:٥٥ | Saat on ikiye beş kala çıkıyor. |
| ١٢:٥٩ | Saat bire bir kala çıkıyor. |

تێبینی:

١- لەهەردوو شێوازی دەربڕینی کاتژمێردا A/B پاشگرەکان وەك یەکن و ناگۆڕێن، **تەنها جیاوازیەکە لە (geçıyor/var) و (geçe/kala) دایە**. ئەگەر پرسیار دەربارەی کاتژمێر چەندە؟ (saat kaç?) بکرێت ئەوا (geçıyor/var) بەکاردێت، بەڵام ئەگەر پرسیار لە کات و ساتی کارێك بکرێت (saat kaçta?) ئەوا (geçe/kala) بەکاردێت.

٢- دەبێ جیاوازی بکەین لەنێوان هەردوو پرسیاری کاتژمێر چەندە(Saat kaç?) و چەند کاتژمێر(Kaç saat?). وەڵامی یەکەمیان بە شێوازی دەربڕینی کاتژمێر دەدرێتەوە وەك لە سەرەوە ڕوون کراوەتەوە، بەڵام پرسیاری دووەم هیچ پەیوەندیەکی بە شێوازی دەربڕینی کاتژمێرەوە نیە، بۆ نمونە:

| Saat beşi on geçe çalışıyor.<br>کاتژمێر پێنج و دە خولەك کار دەکات. | Saat kaçta çalışıyor?<br>کاتژمێر چەند کاردەکات؟ |
|---|---|
| Her gün beş saat çalışıyor.<br>هەر ڕۆژێك پێنج کاتژمێر کار دەکات. | Kaç saat çalışıyor?<br>چەند کاتژمێر کاردەکات؟ |

## • پێش و پاش (Önce & Sonra)

**- لەگەڵ ناو (İsim)**

| پێش | **İsim + -DAn + önce** |
| --- | --- |
| پاش | **İsim + -DAn + sonra** |

پاشگری حاڵی (**-DAn**) بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی دووانەیی و یاسای فستقچی شەهاب **ئەگەری دەرکەوتنی بە چوار شێوە هەیە (-dan/-den/-tan/-ten)**.

| | |
| --- | --- |
| Namaz**dan önce** abdest alıyorum. | پێش نوێژ دەستنوێژ دەگرم. |
| Namaz**dan sonra** dua ediyorum. | لەدوای نوێژ دوعا دەکەم. |
| Ders**ten önce** kahvaltı yapıyorum. | پێش دەرس نانی بەیانی دەخۆم. |
| Ders**ten sonra** çarşıya gidiyorum. | دوای دەرس دەچمە بازاڕ. |

**- لەگەڵ فرمان (Fiil)**

| پێش | **Fiil + -mAdAn + önce** |
| --- | --- |
| پاش | **Fiil + -DIktAn + sonar** |

پاشگری (**-mAdAn**) بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی دوانەیی **ئەگەری دەرکەوتنی بە دوو شێوە هەیە (-madan/-meden)**.

پاشگری (**-DIktAn**) بەگوێرەی یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی و یاسای فستقچی شەهاب **ئەگەری دەرکەوتنی بە هەشت شێوە هەیە (-dıktan/-dikten/-duktan/-dükten/-tıktan/-tikten/-tuktan/-tükten)**.

| Namaz kıl**madan önce** abdest alıyorum.<br>پێش نوێژکردن دەستنوێژ دەگرم. |
| --- |

| |
|---|
| Yemek ye**meden önce** elimi yıkıyorum.<br>پێش نانخواردن دەستم دەشۆم. |
| Uyu**madan önce** kitap okuyorum.<br>پێش خەوتن کتێب دەخوێنمەوە. |
| Namaz kıl**dıktan sonra** dua ediyorum.<br>دوای نوێژکردن دوعا دەکەم. |
| Yemek ye**dikten sonra** çıkıyorum.<br>دوای نانخواردن دەردەچم. |
| Uyu**duktan sonra** rüya görüyorum.<br>دوای خەوتن خەون دەبینم. |

- پلەی بەراورد و پلەی بالاّ (daha & en)

| پلەی بەراورد (daha)<br>**İsim + -DAn + daha + sıfat** | |
|---|---|
| Ali, Aso’dan daha uzun. | عەلی لە ئاسۆ درێژترە. |
| Kitap, cep telefondan daha iyi. | کتێب لە مۆبایل باشترە. |
| Türkiye, Irak’tan daha büyük. | تورکیا لە عێراق گەورەترە. |
| Runa, Simge’den daha güzel. | ڕوونە لە سیمگە جوانترە. |
| Gelin, damattan daha yaşlı. | بووک لە زاوا بە تەمەنترە. |
| Japonya malı çok daha iyi. | مارکەی ژاپۆنی زۆر باشترە. |
| پلەی بالاّ (en)<br>**en + sıfat** | |
| En süslü şehir İstanbul’dur. | ڕازاوەترین شار ئیستەنبوڵە. |

| | |
|---|---|
| Sınıfın en uzun boylu Ali’dir. | بالآبەرزترینی پۆل عەلیە. |
| Kürdistan dünyanın en güzel yeridir. | کوردستان جوانترین شوێنی دونیایە. |
| Amazon en uzun ırmaktır. | ئەمەزۆن درێژترین ڕووبارە. |
| Çin en kalabalık ülkedir. | چین قەرەباڵغترین وولاتە. |
| Dolma en nefis aştır. | دۆڵمە بە لەزەتترین چێشتە. |

- لەوەتەی (-DAn beri)

| | |
|---|---|
| -dan/-den<br>-tan/-ten | Beri |
| | bu yana |
| | bu tarafa |
| --- | -Dir |

هەرچواریان (**-DAn beri/-bu yana/-bu tarafa/-DIr**) **بەمانای (لەوەتەی) دێن و هیچ جیاوازیەکیان نیە لەڕوویماناوە**. بەڵام لەلایەن قسەکەرانی تورکەوە زیاتر (-DAn beri) بەکاردێت. هەمیشە دەبێ لەپێشیانەوە ناو (isim) هەبێت. بەڵام ئەگەر ڕۆژ و مانگ و ساڵ و کاتی دیاریکراو هەبوو لە ڕستەدا نابێ (-DIr) بەمانای (لەوەتەی) بەکاربهێنرێ.

| |
|---|
| Ali ٢٠ Eylül’**den beri** Türkiye’dedir.<br>عەلی لەوەتەی بیستی ئەیلولەوە لە تورکیایە. |
| Ali ٦٠ gün**den beri** Türkiye’de yaşıyor.<br>عەلی لەوەتەی شەست ڕۆژە لە تورکیا دەژی. |
| Ali ٦٠ gün**den bu yana** Türkiye’de yaşıyor.<br>عەلی لەوەتەی شەست ڕۆژە لە تورکیا دەژی. |

| Ali ٦٠ gün**den bu tarafa** Türkiye’de yaşıyor.<br>عەلی لەوەتەی شەست ڕۆژە لە تورکیا دەژی. |
|---|
| Ali ٦٠ gün**dür** Türkiye’de yaşıyor.<br>عەلی شەست ڕۆژە لە تورکیا دەژی. |
| Kış**tan beri** Kayseri’deyim.<br>لەوەتەی زستانەوە لە قەیسەریم. |
| Saat ١٢’**den beri** seni bekliyorum.<br>لەوەتەی سەعات دووانزەوە چاوەڕێی تۆ دەکەم. |
| Çocukluk**tan beri** onu tanıyorum.<br>لەوەتەی منداڵیەوە ئەو دەناسم. |

- هەتا/ تاوەکو (-A kadar)

١- هەتا / تاوەکو

| **İsim + (y) -A kadar** |
|---|
| Dersimiz Ağustos’**a kadar** devam ediyor.<br>دەرسمان تا مانگی ئاب بەردەوام دەبێت. |
| Okulumuzu saat üç**e kadar** açık.<br>قوتابخانەکەمان تا کاتژمێر سێ کراوەیە. |
| Çarşı**ya kadar** koşuyoruz.<br>هەتا بازاڕ ڕادەکەین. |
| Üniversite**ye kadar** seninle geliyorum.<br>تا زانکۆ لەگەڵ تۆ دێم. |

تێبینی: ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە پیتێکی دەنگی ئەوا **پیتی (Y) وەك ناوبڕ لەنێوان ناوەکە و ئامرازی (-A kadar) دادەنێین**.

٢- لە....وە ....هەتا

| **İsim + -DAn + isim + -A kadar** |
|---|
| Seki**zden** dörd**e** **kadar** çalışıyorum.<br>لە کاتژمێر هەشتەوە تا چوار کار دەکەم. |
| Sabah**tan** akşam**a** **kadar** okuyorum.<br>لەبەیانیەوە تا ئێوارە دەخوێنمەوە. |
| Ocak**tan** şubat**a** **kadar** tatilimiz var.<br>لەکانوونی دووەمەوە تا شوبات پشومان هەیە. |
| Saat kaç**tan** kaç**a** **kadar** sürüyor?<br>لە کاتژمێر چەندەوە بۆ چەند دەخایەنێ؟ |

- مۆڵەت وەرگرتن (İzin Cümlesi)

ئەم جۆرە ڕستەیە **بۆ ئیزن وەرگرتنە بەشێوەیەکی بەڕێزانە**، تیایدا تەنها هەردوو کەسی یەکەمی تاك و کۆ (**Ben/Biz**) بەکاردێت.

| Fiil + (y) -Abilir + miyim?<br>miyiz? |
|---|

ئەگەر فرمانێك کۆتایی هاتبوو بەپیتێکی دەنگی ئەوا **پیتی (Y) وەك ناوبڕ** لەنێوان فرمانەکە و (-Abilir) دادەنێین.

| | |
|---|---|
| Ben dışarı çık**abilir miyim**? | من دەتوانم بچمە دەرەوە؟ |
| Bir bardak su iç**ebilir miyim**? | دەتوانم بەرداخێك ئاو بخۆمەوە؟ |
| Pardon, Bir soru sor**abilir miyim**? | ببورە، دەتوانم پرسیارێك بكەم؟ |
| Masayı temizle**yebilir miyiz**? | دەتوانین مێزەكە پاك بكەینەوە؟ |
| Cevap ver**ebilir miyiz**? | دەتوانین وەڵام بدەینەوە؟ |

لە زمانی توركیدا بۆ ئاخاوتن و داواكردنی شتێك بەشێوەیەكی ڕەوشت بەرزانە، كەسی داواكەر شێوەی كەسی دووەمی كۆ بەكاردێنێ، بۆ نمونە لەڕێستۆرانت لەجیاتی بەشێوازی فەرمان كردن بڵێت (بیبسیەكم بۆ بێنە)، دەڵێت (دەتوانین بیبسیەك بێنین؟).

- تكاكردن (Rica Cümlesi)

- ئەم جۆرە ڕستەیە **بۆ داواكردنی شتێكە لە كەسێك بەشێوەیەكی بەڕێزانە**، تیایدا تەنها هەردوو كەسی دووەمی تاك و كۆ (**Sen/Siz**) بەكاردێت.

| Fiil + (y) -Abilir + misin?<br>misiniz? |
|---|

| | |
|---|---|
| Bir bardak su ver**ebilir misin**? | دەتوانی بەرداخێك ئاوم بدەیتێ؟ |
| Tahtayı sil**ebilir misin**? | دەتوانی تەختەكە بسڕیتەوە؟ |
| Bana yardım ed**ebilir misiniz**? | دەتوانن یارمەتیم بدەن؟ |
| Benimle gel**ebilir misiniz**? | دەتوانن لەگەڵ من بێن؟ |
| Çantayı kaldır**abilir misin**? | دەتوانی جانتاكە هەڵبگریت؟ |

## • پاشگری (Ki)

**پاشگری (ki)** لەزمانی تورکیدا **نزیکەی دە ئەرك و مانای جیاوازی هەیە**، بەڵام بـەهۆی ئەوەی قوتابی لە ئاستی یەکەمدا هەموو بابەتە ڕێزمانیەکانی وەرنەگرتووە، لەو ئاسـتەدا تەنها سێ حاڵەتی بڵاوی وەردەگرین (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە لا ٣٧٥).

١- وەك بەستەر (ki bağlacı): لێرەدا **مانای (کە)ی هەیە** بـۆ بەسـتنەوەی دوو ڕسـتە بەیەکترەوە.

| | |
|---|---|
| Sınıfa girdim. | Sınıfa girdim **ki** öğrenciler yoktu. |
| öğrenciler yoktu. | کە چوومە پۆلەوە قوتابییەکان لەوێ نەبوون. |
| Bankaya vardım. | Bankaya vardım **ki** para yoktu. |
| Para yoktu. | کە گەیشتمە بانك پارە نەبوو. |

٢- پەیوەستی (ki ilgi zamiri ): لێرەدا **مانای (ئەوەی) هەیە**، (ئەوەی مـن، ئـەوەی تۆ، ئەوەی ئەو ...هتد).

| | |
|---|---|
| Benim kalemim güzel, senin**ki** nasıl? | پێنووسەکەی من جوانە، ئەوەی تۆ چۆنە؟ |
| Ali’nin**ki** daha uzun. | ئەوەی عەلی درێژترە. |
| Benim**ki** daha güçlü. | ئەوەی من بەهێزترە. |
| Senin**ki** daha güzel. | ئەوەی تۆ جوانترە. |
| Onun**ki** çok çirkin. | ئەوەی ئەو زۆر ناشیرینە. |
| Bizim**ki** iyi. | ئەوەی ئێمە باشە. |
| Sizin**ki** doğru. | ئەوەی تۆ ڕاستە. |
| Onların**ki** renkli. | ئەوەی ئەوان ڕەنگاو ڕەنگە. |

٣- وەك ئامرازی دیاریکەر (-DAki sıfat alan): لێرەدا **بەمانای (ئـەوەی لـە) دێـت** (ئەوەی لەناو، ئەوەی لەگەڵ...هتد)، بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی دوانەیی و یاسای فستقچی شەهاب بەچوار شێواز دەردەکەوێ (**-daki/-deki/-taki/-teki**).

| Hangi çocuk?   کامە منداڵ؟ | |
|---|---|
| Ev**deki** çocuk. | ئەو منداڵەی لە ماڵەکەیە. |
| Araba**daki** çocuk. | ئەو منداڵەی لەناو ئۆتۆمبێلەکەیە. |
| Cami**deki** çocuk. | ئەو منداڵەی لە مزگەوتە. |
| Ali’**deki** kitap. | ئەو کتێبەی لای عەلیە. |
| Masa**daki** kitap. | ئەو کتێبەی لەسەر مێزە. |

تێبینی:

١- دوو ووشەی شازمان هەیە لە زمانی تورکی کەبریتین لە (ئەوەی دوێنـێ - **dünkü**) و (ئەوەی ئەمڕۆ - **bugünkü**)، جگە لـەم دوو حاڵەتـە هەمیشـە پاشـگری (ki) وەك خۆی دەمێنێتەوەو ناگۆڕێت.

٢- لەگەڵ ناوی کاتەکاندا پاشگری (ki) ڕاستەوخۆ پێیان وەدەنووسێنرێ و پێویست بە (-DA) ناکات.

| Gece**ki**<br>ئەوەی شەو | Akşam**ki**<br>ئەوەی ئێوارە | Hafta**ki**<br>**ئەوەی هەفتە** | Yarın**ki**<br>ئەوەی سبەی |
|---|---|---|---|
| | Sabah**ki**<br>ئەوەی بەیانی | Yıl**ki**<br>ئەوەی ساڵ | Ay**ki**<br>ئەوەی مانگ |

- چەند ئامرازێکی گرنگ

- **هەموو (Bütün)**: زۆربەی کات لەسەرەتای ڕستە دێـت و لـە دوایشـی نـاوێکی کـۆ دێت.

| **Bütün** öğrenciler buraya geliyor. |
|---|
| هەموو قوتابیان دێنە ئێرە. |
| **Bütün** Türkler çay içiyor. |
| هەموو تورکەکان چای دەخۆنەوە. |

- **هەر، هەموو (Her)**: زۆربەی کات لەسەرەتای ڕستە دێت و لەدوایشـی نـاوێکی تـاك دێت.

| **Her** gün ders çalışıyorum. |
|---|
| هەموو ڕۆژێك دەرس دەخوێنم. |
| **Her**kes buraya baksın. |
| با هەمووان سەیری ئێرە بکەن. |

- **هەمووی (Hepsi)**: لەحاڵەتی تەواوکاریی ناویی دێت، بۆیە لەسەرتای ڕستەدا نایەت.

| Öğrencilerin **hepsi** ders çalışıyor. |
|---|
| قوتابیان هەموویان دەرس دەخوێنن. |
| Öğrencilerin **hepsi** tatil istiyor. |
| قوتابیان هەموویان پشوویان دەوێت. |

- **هیچ یەکێك (Hiçbir)**: لەگەڵ ڕستەی نەرێی تاك دێت.

| **Hiçbir** öğrenci ödev yapmiyor. |
|---|

| هیچ قوتابیەك ئەركی ماڵەوە ناكات. |
| --- |
| Hiçbir kimseyi göremedim.<br>نەمتوانی هیچ کەسێك ببینم. |

- **هیچ یەکێکیان (Hiçbiri):** لەگەڵ ڕستەی نەرێی کـۆ دێـت لـە حاڵـەتی تـەواوکاری ناویی.

| Öğrencilerin **hiçbiri** konsere gelmiyor.<br>هیچ یەکێك لەقوتابییەکان نایەنە کۆنسێرتەکە. |
| --- |
| İnsanların **hiçbiri** konuşmuyor.<br>هیچ یەکێك لە مرۆڤەکان قسە ناکەن. |

- **هەندێك (Bazı)، هەندێکیان (Bazısı):**

| **Bazı** öğrenciler hiç konuşmuyor.<br>هەندێك لە قوتابیەکان هیچ قسە ناکەن. |
| --- |
| Öğrencilerin **bazısı** hiç konuşmuyor.<br>قوتابییەکان هەندێکیان هیچ قسە ناکەن. |

- **هیچ کەسێك (Hiç kimse)** نەرێیە X **هەموو کەسێك (Herkes)** ئەرێیە:

| **Hiç kimse** beni sevmiyor.<br>هیچ کەسێك منی خۆش ناوێت. |
| --- |
| **Herkes** beni seviyor.<br>هەموو کەسێك منی خۆش دەوێت. |

## - کاتی ڕابردوو (Geçmiş Zaman)

کاتی ڕابردوو لەزمانی تورکیدا دوو جۆری هەیە کە بریتین لە:

١- کاری ڕابردووی **بینراو** (-DI) (**Görülen** Geçmiş Zaman).

٢- کاری ڕابردووی **بیستراو** (-mIş) (**Duyulan** Geçmiş Zaman).

## • کاتی ڕابردووی **بینراو** ( Görülen Geçmiş Zaman) (dili)

لەم شێوازەدا کەسی قسەکەر دەربارەی ڕووداوێك یان باسێك دەدوێت کە **بەچاوی خۆی بینیوویەتی و ئاگاداری ڕوودانی بووە** لە ڕابردوودا. ئەمەشیان دەبێتە دوو جۆرو ڕستەی ناویی و ڕستەی فرمانی هەیە.

### ١–ڕستەی ناویی (İsim Cümlesi)

| یاسای حاڵەتەکانی ڕستەی ناویی، کاتی ڕابردووی بینراو (kurallar) | |
|---|---|
| İsim/sıfat + (y) -DI + şahıs eki | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| İsim/sıfat + değil + -DI + şahıs eki | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| İsim/sıfat + mI+ (y) -DI + şahıs eki? | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| İsim/sıfat + değil + mI + (y) -DI + şahıs eki? | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

تێبینی:

١- ئەگەر ناوێك كۆتایی هاتبوو بەپیتێكی دەنگی ئەوا (**Y**) **وەك ناوبڕ لەنێوان ناوەكەو پاشگری (-DI) دادەنرێت** (ئەمەش تایبەتە بە ڕستەی ناویی و بۆ حاڵەتی هاوشێوەدا لە ڕستەی فرمانی ئەو ناوبڕە دانانرێت). وەك:

Hast**a** + (y) -DI + şahıs eki = Hasta**y**dım.

Mutlu + (y) -DI + şahıs eki = Mutlu**y**dum

٢- **پاشگری ڕابردووی بینراو (-DI)** بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی و یاسای فستقچی شەهاب **ئەگەری دەركەوتنی بە هەشت شێواز هەیە:**

| | | | |
|---|---|---|---|
| a , ı | -dı | Yazar**dı** | نووسەربوو |
| e , i | -di | Öğrenciy**di** | قوتابی بوو |
| u , o | -du | Doktor**du** | دكتۆر بوو |
| ü , ö | -dü | Üzgün**dü** | دڵتەنگ بوو |
| a , ı + FSTKÇŞHP | -tı | Utangaç**tı** | شەرمن بوو |
| e , i + FSTKÇŞHP | -ti | Cömert**ti** | سەخی بوو |
| u , o + FSTKÇŞHP | -tu | Soğuk**tu** | سارد بوو |
| ü , ö + FSTKÇŞHP | -tü | Çürük**tü** | ڕزی بوو |

٣- جێناوە كەسیەكان (Şahıs eki)

بۆ كاتی ڕابردووی بینراو هەندێ گۆڕانكاریان بەسەردا دێت وەك لەو خشتەیەدا ڕوون كراوەتەوە:

| | |
|---|---|
| Ben | -m |
| Sen | -n |
| O | - |
| Biz | -k |
| Siz | -nIz |
| Onlar | - / -lAr |

- حاڵەتەکانی ڕستەی ناویی، کاتی ڕابردووی بینراو (Görülen Geçmiş Zaman)

یەکەم/ حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu):

| کەسەکان | İsim/sıfat + (y) -DI + şahıs eki | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | İyiydim<br>باش بووم | Şişmandım<br>قەڵەو بووم | Doktordum<br>دکتۆر بووم | Üzgündüm<br>دڵتەنگ بووم |
| Sen | İyiydin<br>باش بوویت | Şişmandın<br>قەڵەو بوویت | Doktordun<br>دکتۆر بوویت | Üzgündün<br>دڵتەنگ بوویت |
| O | İyiydi<br>باش بوو | Şişmandı<br>قەڵەو بوو | Doktordu<br>دکتۆر بوو | Üzgündü<br>دڵتەنگ بوو |
| Biz | İyiydik<br>باش بووین | Şişmandık<br>قەڵەو بووین | Doktorduk<br>دکتۆر بووین | Üzgündük<br>دڵتەنگ بووین |
| Siz | İyiydiniz<br>باش بوون | Şişmandınız<br>قەڵەو بوون | Doktordunuz<br>دکتۆر بوون | Üzgündünüz<br>دڵتەنگ بوون |
| Onlar | İyiydi<br>İyiydiler<br>باش بوون | Şişmandı<br>Şişmandılar<br>قەڵەو بوون | Doktordu<br>Doktordular<br>دکتۆر بوون | Üzgündü<br>Üzgündüler<br>دڵتەنگ بوون |

دووەم/ حاڵەتی **نەرێ** (olumsuz): لە زمانی تورکیدا هەمیشە ڕستەی ناویی بە ووشەی (değil) واتە (نی) دەبێتە نەرێ.

| کەسەکان | İsim/sıfat + değil + -DI + şahıs eki | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | İyi değildim<br>باش نەبووم | Şişman değildim<br>قەڵەو نەبووم | Doktor değildim<br>دکتۆر نەبووم | Üzgün değildim<br>دڵتەنگ نەبووم |
| Sen | İyi değildin | Şişman değildin | Doktor değildin | Üzgün değildin |

| | باش نەبوویت | قەڵەو نەبوویت | دکتۆر نەبوویت | دڵتەنگ نەبوویت |
|---|---|---|---|---|
| O | İyi değildi<br>باش نەبوو | Şişman değildi<br>قەڵەو نەبوو | Doktor değildi<br>دکتۆر نەبوو | Üzgün değildi<br>دڵتەنگ نەبوو |
| Biz | İyi değildik<br>باش نەبووین | Şişman değildik<br>قەڵەو نەبووین | Doktor değildik<br>دکتۆر نەبووین | Üzgün değildik<br>دڵتەنگ نەبووین |
| Siz | İyi değildiniz<br>باش نەبوون | Şişman değildiniz<br>قەڵەو نەبوون | Doktor değildiniz<br>دکتۆر نەبوون | Üzgün değildiniz<br>دڵتەنگ نەبوون |
| Onlar | İyi değildi<br>İyi değildiler<br>باش نەبوون | Şişman değildi<br>Şişman değildiler<br>قەڵەو نەبوون | Doktor değildi<br>Doktor değildiler<br>دکتۆر نەبوون | Üzgün değildi<br>Üzgün değildiler<br>دڵتەنگ نەبوون |

سێیەم/ حاڵەتی **پرسیاری ئەرێ** (olumlu soru) : بەپاشگری پرسیاری (mI) دەبێتە پرسیاری ئەرێ.

| کەسەکان | **İsim/sıfat + mI+ (y) -DI + şahıs eki ?** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | İyi miydim?<br>باش بووم؟ | Şişman mıydım?<br>قەڵەو بووم؟ | Doktor muydum?<br>دکتۆر بووم؟ | Üzgün müydüm?<br>دڵتەنگ بووم؟ |
| Sen | İyi miydin?<br>باش بوویت؟ | Şişman mıydın?<br>قەڵەو بوویت؟ | Doktor muydun?<br>دکتۆر بوویت؟ | Üzgün müydün?<br>دڵتەنگ بوویت؟ |
| O | İyi miydi?<br>باش بوو؟ | Şişman mıydı?<br>قەڵەو بوو؟ | Doktor muydu?<br>دکتۆر بوو؟ | Üzgün müydü?<br>دڵتەنگ بوو؟ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Biz | İyi miydik?<br>باش بووین؟ | Şişman mıydık?<br>قەڵەو بووین؟ | Doktor muyduk?<br>دکتۆر بووین؟ | Üzgün müydük?<br>دڵتەنگ بووین؟ |
| Siz | İyi miydiniz?<br>باش بوون؟ | Şişman mıydınız?<br>قەڵەو بوون؟ | Doktor muydunuz?<br>دکتۆر بوون؟ | Üzgün müydünüz?<br>دڵتەنگ بوون؟ |
| Onlar | İyi miydi?<br>İyi miydiler?<br>باش بوون؟ | Şişman mıydı?<br>Şişman mıydılar?<br>قەڵەو بوون؟ | Doktor muydu?<br>Doktor muydular?<br>دکتۆر بوون؟ | Üzgün müydü?<br>Üzgün müydüler?<br>دڵتەنگ بوون؟ |

چوارەم/ حاڵەتی **پرسیاری نەرێ** (olumsuz soru):

| کەسەکان | **İsim/sıfat + değil + mI + (y) -DI + şahıs eki** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | İyi değil miydim?<br>باش نەبووم؟ | Şişman değil miydim?<br>قەڵەو نەبووم؟ | Doktor değil miydim?<br>دکتۆر نەبووم؟ | Üzgün değil miydim?<br>دڵتەنگ نەبووم؟ |
| Sen | İyi değil miydin?<br>باش نەبوویت؟ | Şişman değil miydin?<br>قەڵەو نەبوویت؟ | Doktor değil miydin?<br>دکتۆر نەبوویت؟ | Üzgün değil miydin?<br>دڵتەنگ نەبوویت؟ |
| O | İyi değil miydi?<br>باش نەبوو؟ | Şişman değil miydi?<br>قەڵەو نەبوو؟ | Doktor değil miydi?<br>دکتۆر نەبوو؟ | Üzgün değil miydi?<br>دڵتەنگ نەبوو؟ |
| Biz | İyi değil miydik?<br>باش نەبووین؟ | Şişman değil miydik?<br>قەڵەو نەبووین؟ | Doktor değil miydik?<br>دکتۆر نەبووین؟ | Üzgün değil miydik?<br>دڵتەنگ نەبووین؟ |
| Siz | İyi değil miydiniz?<br>باش نەبوون؟ | Şişman değil miydiniz?<br>قەڵەو نەبوون؟ | Doktor değil miydiniz?<br>دکتۆر نەبوون؟ | Üzgün değil miydiniz?<br>دڵتەنگ نەبوون؟ |

| Onlar | İyi değil miydi?<br>İyi değil miydiler?<br>باش نەبوون؟ | Şişman değil miydi?<br>Şişman değil miydiler?<br>قەڵەو نەبوون؟ | Doktor değil miydi?<br>Doktor değil miydiler?<br>دکتۆر نەبوون؟ | Üzgün değil miydi?<br>Üzgün değil miydiler?<br>دڵتەنگ نەبوون؟ |
|---|---|---|---|---|

| حاڵەتەکان | نمونەی هەر چوار حاڵەتەکە لەنێو ڕستەدا | |
|---|---|---|
| ئەرێ | Ben yazardım.<br>Sen yazardın.<br>O yazardı.<br>Biz yazardık.<br>Siz yazardınız.<br>Onlar yazardı. / yazardılar. | من نووسەر بووم.<br>تۆ نووسەر بوویت.<br>ئەو نووسەر بوو.<br>ئێمە نووسەر بووین.<br>ئێوە نووسەر بوون.<br>ئەوان نووسەر بوون. |
| نەرێ | Ben yazar değildim.<br>Sen yazar değildin.<br>O yazar değildi.<br>Biz yazar değildik.<br>Siz yazar değildiniz.<br>Onlar yazar değildi. / değildiler. | من نووسەر نەبووم.<br>تۆ نووسەر نەبوویت.<br>ئەو نووسەر نەبوو.<br>ئێمە نووسەر نەبووین.<br>ئێوە نووسەر نەبوون.<br>ئەوان نووسەر نەبوون. |
| پرسیاری ئەرێ | Ben yazar mıydım?<br>Sen yazar mıydın?<br>O yazar mıydı?<br>Biz yazar mıydık?<br>Siz yazar mıydınız?<br>Onlar yazar mıydı? / mıydılar? | من نووسەر بووم؟<br>تۆ نووسەر بوویت؟<br>ئەو نووسەر بوو؟<br>ئێمە نووسەر بووین؟<br>ئێوە نووسەر بوون؟<br>ئەوان نووسەر بوون؟ |
| پرسیاری نەرێ | Ben yazar değil miydim?<br>Sen yazar değil miydin?<br>O yazar değil miydi?<br>Biz yazar değil miydik?<br>Siz yazar değil miydiniz?<br>Onlar yazar değiller miydi? miydiler? | من نووسەر نەبووم؟<br>تۆ نووسەر نەبوویت؟<br>ئەو نووسەر نەبوو؟<br>ئێمە نووسەر نەبووین؟<br>ئێوە نووسەر نەبوون؟<br>ئەوان نووسەر نەبوون؟ |

## ٢–ڕستەی فرمانی (Fiil Cümlesi)

| یاسای حاڵەتەکانی ڕستەی فرمانی، کاتی ڕابردووی بینراو (kurallar) | |
|---|---|
| Fiil + -DI + şahıs eki | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| Fiil + -mA + -DI + şahıs eki | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| Fiil + -DI + şahıs eki + mI ? | حاڵەتی پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| Fiil + -mA+ -DI+ şahıs eki + mI? | حاڵەتی پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

تێبینی:

١- ئەم شێوازە بۆ قسەکردن دەربارەی کارێکی ڕابردووە کە **قسەکەر خۆی بینیوویەتی و ئاگاداری ڕوودانی بووەو** بە پاشگری (-DI) دەناسرێتەوە.

٢- پاشگری ڕابردووی بینراو (-DI) بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی چواریی و یاسای فستقچی شەهاب ئەگەری دەرکەوتنی بە هەشت شێواز هەیە:

| a , ı | -dı | Çağır**dı** | بانگی کرد |
|---|---|---|---|
| e , i | -di | Gel**di** | هات |
| u , o | -du | Vur**du** | لێیدا |
| ü , ö | -dü | Üzül**dü** | دڵی تەنگ بوو |
| a , ı + FSTKÇŞHP | -tı | Yap**tı** | کردی |
| e , i + FSTKÇŞHP | -ti | Git**ti** | ڕۆیشت |
| u , o + FSTKÇŞHP | -tu | Koş**tu** | ڕایکرد |
| ü , ö + FSTKÇŞHP | -tü | Öp**tü** | ماچی کرد |

٣- جێناوە کەسیەکان(Şahıs eki) بۆ کاتی ڕابردووی بینراو هەندێ گۆڕانکاریان بەسەر دێت وەك لەو خشتەیەدا ڕوون کراوەتەوە:

| Ben | -m |
|---|---|
| Sen | -n |
| O | - |
| Biz | -k |
| Siz | -nIz |
| Onlar | - / - lAr |

- حاڵەتەکانی ڕستەی فرمانی، کاتی ڕابردووی بینراو (Görülen Geçmiş Zaman)

یەکەم/ حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu):

| کەسەکان | Fiil + -DI + şahıs eki | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Geldim<br>هاتم | Yazdım<br>نووسیم | Okudum<br>خوێندمەوە | Güldüm<br>پێکەنیم |
| Sen | Geldin<br>هاتیت | Yazdın<br>نووسیت | Okudun<br>خوێندتەوە | Güldün<br>پێکەنیت |
| O | Geldi<br>هات | Yazdı<br>نووسی | Okudu<br>خوێندیەوە | Güldü<br>پێکەنی |
| Biz | Geldik<br>هاتین | Yazdık<br>نووسیمان | Okuduk<br>خوێندمانەوە | Güldük<br>پێکەنین |
| Siz | Geldiniz<br>هاتن | Yazdınız<br>نووسیتان | Okudunuz<br>خوێندتانەوە | Güldünüz<br>پێکەنین |
| Onlar | Geldi<br>Geldiler<br>هاتن | Yazdı<br>Yazdılar<br>نووسیان | Okudu<br>Okudular<br>خوێندیانەوە | Güldü<br>Güldüler<br>پێکەنین |

- جێناوی پرس (Soru Zamirleri)

**هەموو ووشە پرسەکانی زمانی تورکی دەگرێتەوە** وەك:

| | |
|---|---|
| **Kim** geç kaldı? | کێ درەنگ کەوتوە؟ |
| **Hangisi** daha iyi? | کامەیان باشترە؟ |
| **Kimi** seviyorsun? | کێت خۆش دەوێت؟ |
| **Kaçı** sertifikası alacak? | چەندەیان بڕوانامە بەدەست دەهێنن؟ |

- جێناوی نادیار (Belirsizlik Zamirleri)

جێناوە نادیارەکان لە زمانی تورکیدا ژمارەیان زۆرە لەوانەش:

| | | | |
|---|---|---|---|
| Herkes | هەموو کەسێك | Hiç kimse | هیچ کەسێك |
| Her şey | هەموو شتێك | Hiçbir şey | هیچ شتێك |
| Hep | هەموو | Hepsi | هەمووی |
| Hepimiz | هەموومان | Hepiniz | هەمووتان |
| Bütünü | هەرهەمووی | Tümü | گشتی |
| Tam | تەواوی، گشت | Biri | یەکێك |
| Pekçoğu | زۆربەی زۆری | Birçoğu | زۆرێکی |
| Çoğu | زۆربەی | Birazı | کەمێکی |
| Birkaçı | هەندێکی | Kimi | هەندێ |

| Bazı | هەندێ | Bazısı | هەندێکی |
|---|---|---|---|
| Başkası | یەکێکی تری | Kimisi | کێهەیان |

ئەو جێناوانەی سەرەوەی لە ڕستەدا وەڵامی ئەو ووشە پرسانە دەدەنەوە:

| Kim? | Kimler? | Neler? | Hangisi? |
|---|---|---|---|
| Hangileri? | Ne kadarı? | Kaçı? | |

| Herkes mutlu oldu. | هەمووان دڵخۆش بوون. |
|---|---|
| Hepsi/bütünü/tümü boş. | هەمووی/گشتی بەتاڵە. |
| Hiç kimsede para yok. | هیچ کەس پارەی پێ نیە. |
| Pekçoğu pikniğe gitti. | زۆربەیان چوونەتە سەیران. |
| Biri sınıfa geldi. | یەکێ هاتە پۆلەوە. |
| Birkaçını okudum. | هەندێکیم خوێندەوە. |
| Bazıları renkli. | هەندێکیان ڕەنگاو ڕەنگن. |

- ڕستەی هۆکار و ئەنجام (Sebep & Sonuç cümlesi)

| **ووشە پرسەکانی ڕستەی هۆکاریی** | **ووشە وەڵامیەکانی ڕستەی ئەنجامی** |
|---|---|
| Neden?<br>لەبەرچی؟ | Bunun için / Bunun üzerine<br>لەبەر ئەوە |
| Niçin?<br>بۆچی؟ | Bu sebeple / Bu nedenle<br>لەبەر ئەو هۆکارە |
| Niye?<br>بۆ؟ | Bu yüzden<br>لەبەر ئەوە |
| Ne diye?<br>لەبەرچی؟ | Bundan dolayı / Bundan ötürü<br>لەبەر ئەوە |
| | Dolayısıyla<br>بەو بۆنەوە |

| Hava çok soğuk, **bunun için** pikniğe gidemedik.<br>هەوا زۆر ساردە، لەبەر ئەوە نەمانتوانی بچینە سەیران. |
|---|
| Dün gece geç uyudum, **bundan dolayı** geciktim.<br>دوێنێ شەو درەنگ نووستم، لەبەر ئەوە درەنگ کەوتم. |
| Salı günü sinemaya gittik, **bunun üzerine** derse gelmedim.<br>ڕۆژی سێ شەممە چووینە سینەما لەبەر ئەوە نەهاتمە دەرس. |
| Ali kaçtı, **bu yüzden** hoca kızdı.<br>عەلی ڕایکرد بۆیە مامۆستا تورە بوو. |

تێبینی: لە ئاستەکانی داهاتوودا ئەو بابەتە بە تێرو تەسەلتر دەخەینەڕوو.

- ڕستەی ئامانج و ئەنجام (Amaç & Sonuç cümlesi)

| **Fiil + -mAk + için** |
|---|
| Türkçe öğren**mek için** kitap okuyorum.<br>بۆ فێربوونی تورکی کتێب دەخوێنمەوە. |
| Kitap oku**mak için** kütüphaneye gittim.<br>بۆ کتێب خوێندنەوە دەچمە کتێبخانە. |
| Para topla**mak için** çalışırız.<br>بۆ پارە کۆکردنەوە کاردەکەن. |
| Şarkı söyle**mek için** sahneye gidecek.<br>بۆ گۆرانی گوتن دەچێتە سەر شانۆ. |
| Erken kalk**mak için** erken yat.<br>بۆ ئەوەی زوو هەڵسیت زوو پاڵکەوە. |

- لەسایە و بەهۆی (Saye & yüzü)

- **سایە (Saye) هەمیشە بە مانای ئەرێیە** و بۆ دوو مەبەستیش بەکاردێت:

١- **بۆ یارمەتی و پاڵپشتی** (Yardım , Destek).

٢- **بوونە هۆکاری شتێکی باش** (Vesile , Vasıta).

| Sayemde | لەسایەی مندا | Sayemizde | لەسایەی ئێمە |
|---|---|---|---|
| Sayende | لەسایەی تۆدا | Sayenizde | لەسایەی ئێوە |

| Sayesinde | لەسایەی ئەودا | Sayesinde<br>Sayelerinde | لەسایەی ئەوان |
|---|---|---|---|

| Babamın sayesinde üniversiteyi bitirdim.<br>لەسایەی باوکمدا زانکۆم تەواو کرد. |
|---|
| Sayenizde Türkiye’de okuyoruz.<br>لەسایەی ئێوە لە تورکیا دەخوێنین. |
| Sayemizde herşeyiniz var.<br>لەسایەی ئێمە هەموو شتێکتان هەیە. |

- **بەهۆی (Yüzünden) هەمیشە بەمانای نەرێیە** و بۆ بوونە هۆکاری شتی خراپ بەکاردێت.

| Yüzümden | بەهۆی منەوە | Yüzümüzden | بەهۆی ئێمەوە |
|---|---|---|---|
| Yüzünden | بەهۆی تۆوە | Yüzünüzden | بەهۆی ئێوەوە |
| Yüzünden | بەهۆی ئەوەوە | Yüzünden<br>Yüzlerinden | بەهۆی ئەوانەوە |

| Benim yüzümden uçağı kaçırdın. | بەهۆی منەوە فڕۆکەکەتان لەدەست دا. |
|---|---|
| Senin yüzünden hocamız kızdı. | بەهۆی تۆوە مامۆستاکەمان توڕە بوو. |
| Yüzünüzden adam ölecek. | بەهۆی ئێوەوە کابرا دەمرێ. |
| Yüzlerinden hiç kimse gelmedi. | بەهۆی ئەوانەوە کەس نەهات. |
| ABD yüzünden Irak berbat oldu | بەهۆی ئەمریکاوە عێراق بەرباد بوو. |

- پاشگری هاو (-DAş)

دەچێتە سەر ناو و **بەمانای (هاو) دێت**، بەچوار شێوازیش دەردەکەوێ (**-daş/-deş/-taş/-teş**).

| Vatan**daş** | هاونیشتیمانی | Meslek**taş** | هاوپیشە |
| --- | --- | --- | --- |
| Sır**daş** | هاونهێنی | Ülkü**daş** | هاوئامانج |

- سەرباری ئەوەی، هەرچەندە (-A rağmen)

| **Fiil + -A + rağmen / karşın** |
| --- |
| Yağmur yağmasın**a rağmen** sokakta gezer.<br>سەرباری باران بارین لە کۆڵان دەگەڕێ. |
| Ali gelmemesin**e rağmen** toplantı yaptık.<br>سەرباری نەهاتنی عەلی کۆبوونەوەمان کرد. |
| Petrol satmasın**a rağmen** Irak çok fakir bir ülke.<br>سەرباری نەوت فرۆشتن عێراق وولاتێکی زۆر هەژارە. |
| Üniversiteden mezun olmam**a rağmen** atanmadım.<br>سەرباری دەرچوونم لە زانکۆ دانەمەزراوم. |
| Onlara yardım etmelerin**e karşın** durumları çok kötü.<br>هەرچەندە یارمەتیان دەدەن باردودۆخیان زۆر خراپە. |

## • شێوازەکانی زمانی تورکی (Kipler)

لە زمانی تورکیدا پێنج زەمەن (Zaman) مان هەیە کە لە هەردوو ئاستی پێشوودا بەتەواوی خوێنران، ئەوانیش بریتین لە:

١- کاتی ئێستا (Şimdiki Zaman).

٢- کاتی ڕابردووی بینراو (Görülen Geçmiş Zaman).

٣- کاتی ڕابردووی بیستراو (Duyulan Geçmiş Zaman).

٤- کاتی داهاتوو (Gelecek Zaman).

٥- کاتی بەرفراوان (Geniş Zaman).

جگە لەم پێنج کاتەی سەرەوە، چوار شێواز (Kip) یشمان هەیە کە لەو ئاستەدا دەیانخوێنین. ئەوانیش:

١- شێوازی داخوازی-ویستن (Dilek-İstek Kipi).

٢- شێوازی فەرمانی (Emir Kipi).

٣- شێوازی پێویستی (Gereklilik Kipi).

٤- شێوازی مەرجی (Şart Kipi).

- شێوازی داخوازی-ویستن (Dilek-İstek Kipi)

١- ئەم شێوازە **تەنها لەگەڵ فرمان(Fiil) دێت** و لەگەڵ ناو(İsim) نایەت.

٢- تەنها لەگەڵ هەردوو کەسی یەکەمی تاك و کۆ (**Ben/Biz**) بەکاردێت.

| یاسای حاڵەتەکانی شێوازی داخوازی-ویستن (kurallar) | |
|---|---|
| Fiil + (y) -AyIm/-AlIm | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| Fiil + -mA + (y) -AyIm/-AlIm | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| Fiil + (y) -AyIm/-AlIm + mI ? | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| Fiil+ -mA +(y)-AyIm/-AlIm + mI? | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

تێبینی:

١- **پاشگری (-AyIm) بۆ کەسی یەکەمی تاك (Ben) بەکاردێت**، هەرچی **پاشگری (-AlIm) ە بۆ کەسی یەکەمی کـۆ (Biz) بـەکاردێت**. بـەگوێرەی یاسـای هەماهـەنگی دەنگیش **هەر یەکەیان بە دوو شێوە دەردەکەون**.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Ben | -ayım | Yaz-ayım | بنووسم/ با بنووسم |
| | -eyim | İç-eyim | بخۆمەوە/ با بخۆمەوە |
| Biz | -alım | Yaz-alım | بنووسین/ با بنووسین |
| | -elim | İç-elim | بخۆینەوە/ با بخۆینەوە |

٢- ئەگەر فرمانێك کۆتـایی هاتبـێ بـە پیتێکـی دەنگـی، ئـەوا **نـاوبڕی (Y)** لـەنێوان فرمانەکە و پاشگری (-AyIm/-AlIm) دادەنرێت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| Oku-**y**-ayım | با بخوێنمەوە | Oku-**y**-alım | با بخوێنینەوە |

| Başla-**y**-ayım | با دەست پێ بکەم | Başla-**y**-alım | با دەست پێ بکەین |
|---|---|---|---|
| Ağla-**y**-ayım | با بگریم | Ağla-**y**-alım | با بگرین |

٣- فرمانەکانی (**git-**) و (**tat-**) و (**et-**) و **فرمانە کۆتایی هاتووەکان بە (et-) پیتی کۆتاییان دەگۆڕدرێت بۆ (D)** ئینجا ئەو پاشگرانەی دەخرێتە سەر:

| Gi**d**-eyim | بابڕۆم | Ta**d**-alım | با تام بکەین |
|---|---|---|---|
| E**d**-eyim | با بکەم | Bahse**d**-elim | با باس بکەین |

٤- هەردوو فرمانی (**ye-**) و (**de-**) پیتی کۆتاییان دەگۆڕدرێت بۆ (**i**):

| D**i**-y-eyim | با بڵێم | D**i**-y-elim | با بڵێین |
|---|---|---|---|
| Y**i**-y-eyim | با بخۆم | Y**i**-y-elim | با بخۆین |

٥- بەشێوەیەکی گشتی شێوازەکان (kipler) لەڕووی ڕێزمانیەوە مانای کات و ساتێکی دیاریکراو نادەن، بەڵام **شێوازی (داخوازی-ویستن) لەڕووی ماناوە مانای کاتی ئێستا (Şimdiki Z.) و کاتی داهاتوو (Gelecek Z.) دەدات.**

- حاڵەتەکانی شێوازی داخوازی-ویستن (Dilek-İstek Kipi):

| کەسەکان | ئەرێ (olumlu) | نەرێ (olumsuz) | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gel**eyim**<br>با بێم | Gel**meyeyim**<br>با نەیەم | Gel**eyim mi**?<br>ئایا بێم؟ | Gel**meyeyim mi**?<br>ئایا نەیەم؟ |

| | Yap**ayım**<br>با بکەم | Yap**mayayım**<br>با نەکەم | Yap**ayım mı**?<br>ئایا بکەم؟ | Yap**mayayım mı**?<br>ئایا نەکەم؟ |
|---|---|---|---|---|
| Biz | Gel**elim**<br>با بێین | Gel**meyelim**<br>با نەیەین | Gel**elim mi**?<br>ئایا بێین؟ | Gel**meyelim mi**?<br>ئایا نەیەین؟ |
| | Yap**alım**<br>با بکەین | Yap**mayalım**<br>با نەکەین | Yap**alım mı**?<br>ئایا بکەین؟ | Yap**mayalım mı**?<br>ئایا نەکەین؟ |

- بۆ **حاڵـەتی ویسـتن دەتوانرێـت شـێوازی (-mAk iste) یـش بـەکار بهێنرێـت** کـە شێوازێکی باوە لە زمانی تورکیدا.

| **Fiil + -mAk + iste- + zaman ekleri** | |
|---|---|
| Seninle görüş**mek isti**yorum. | دەمەوێ لەگەڵ تۆ یەکتر ببینین. |
| Babamla çalış**mak iste**dim. | ویستم لەگەڵ باوکم کار بکەم. |
| Ankara'ya git**mek iste**rim. | دەمەوێت بچمە ئەنقەرە. |
| Evden çık**mak iste**miyorum. | نامەوێت لەماڵ دەربچم. |
| Araba al**mak iste**memiş. | نەیویست ئۆتۆمبێل بکڕێت. |

- ئەرکەکانی شێوازی داخوازی-ویستن (Dilek-İstek Kipi -İşlev):

١- **خواستن، ئارەزووکردن، ویستن** (İstek, Dilek, Arzu, Talep):

| Haydi, çarşıya gidelim. | یەڵلا با بچینە بازاڕ. |
|---|---|
| Bir bardak süt içeyim. | با بەرداخێك شیر بخۆمەوە. |

| Size yardım edeyim. | با یارمەتی ئێوە بدەم. |
|---|---|

٢- **پلان دانان** (Plan):

| Sınavdan hemen sonra İstanbul’a gidelim.<br>با لەدوای تاقیکردنەوە یەکسەر بچینە ئیستەنبوڵ. |
|---|
| Bu seviyede çok çalışayım.<br>با لەو ئاستە زۆر بخوێنم. |
| Gelecek ay toplanalım.<br>با مانگی داهاتوو کۆببینەوە. |

٣- **بڕیاردان** (Karar vermek):

| Öğle yemeğinde tavuk yiyelim.<br>بۆ نانی نیوەڕۆ با مریشك بخۆین. |
|---|
| Canım biz de evlenelim.<br>گیانم با ئێمەش هاوسەرگیری بکەین. |
| Bu evi satmayalım.<br>با ئەو خانووە نەفرۆشین. |

٤- **ڕاوێژکردن** (İstişare etmek):

| Hangi uçak firmasıyla gideyim? | لەگەڵ کام کۆمپانیای فرۆکەوانی بڕۆم؟ |
|---|---|
| Hangi filmleri izleyelim? | سەیری کام فیلم بکەین؟ |
| Burada oturalım mı? | لێرە دابنیشین؟ |
| Sence bu arabayı alalım mı? | بەڕای تۆ ئەو ئۆتۆمبێلە بکڕین؟ |

٥- **مۆڵەت و ڕەزامەندی وەرگرتن** (İzin istemek, Onaylamak):

| | |
|---|---|
| Sınıfa girelim mi? | بێینە پۆلەوە؟ |
| Ona para vereyim mi? | پارە بدەم بەو؟ |
| Bu belgeyi imzalayalım mı? | ئەو بەڵگەیە واژوو بکەم؟ |
| Sınav bitti, dışarı çıkalım mı? | تاقیکردنەوە تەواوبوو، بچینە دەرەوە؟ |

٦- **تەکلیف کردن** (Teklif etmek):

| |
|---|
| Yemeğe gidelim mi?<br>بچین بۆ نان خواردن؟ |
| Evimize gidelim, yemek yiyelim.<br>با بچینە ماڵی ئێمە، نان بخۆین. |
| Lütfen biraz daha da çalışalım.<br>تکایە با کەمێکی تریش کاربکەین. |
| Yarın erken kalkalım.<br>با بەیانی زوو هەڵبستین. |
| Artık konuşmayalım.<br>با چیتر قسە نەکەین. |

- شێوازی فەرمانی (Emir Kipi)

- ئەم شێوازە **تەنها لەگەڵ فرمان(Fiil) دێت** و لەگەڵ ناو(İsim) نایەت.

- **شێوازی (فەرمانی) بۆ فەرمانکردنە بەسەر کەسێکدا** و بۆ کەسی دووەمی تاك و کۆ (**Sen/Siz**) و کەسی سێیەمی تاك و کۆ (**O/Onlar**) بەکاردێت. (واتە پێچەوانەی شێوازی داخوازی-ویستنە کە ئەویان تەنها بۆ Ben/Biz بەکاردەهات).

| یاسای حاڵەتەکانی شێوازی فەرمانی (kurallar) | |
|---|---|
| حاڵەتی ئەرێ (olumlu) | Fiil + Emir kipi ekleri |
| حاڵەتی نەرێ (olumsuz) | Fiil + -mA + Emir kipi ekleri |
| پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) | Fiil + Emir kipi ekleri + mI ? |
| پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) | Fiil + -mA + Emir kipi ekleri + mI ? |

تێبینی: سەبارەت بەپاشگرەکانی شێوازی فەرمانی(Emir kipi ekleri) ئەوا **بۆ هەر کەسێك لە (Sen / Siz / O / Onlar) پاشگرێکی تایبەت هەیە** تا بیانکاتە شێوازی فەرمانی بەم شێوەیەی خوارەوە:

| Sen | --- |
|---|---|
| Siz | -In / -InIz |
| O | -sIn |
| Onlar | -sIn / -sInlAr |

١- **کەسی دووەمی تاك (Sen): هیچ پاشگرێك وەرناگرێت**. لە زمانی تورکیدا ڕەگی کار لە هەمان کاتدا دەبێتە شێوازی فەرمانی بۆ کەسی دووەمی تاك (Sen) بەم شێوەیە:

| Gel<br>وەرە | Yat<br>پاڵکەوە | Yaz<br>بنووسە | Sil<br>بسڕەوە | Ağla<br>بگری |
|---|---|---|---|---|
| Git<br>بڕۆ | Koş<br>ڕاکە | Oku<br>بخوێنەوە | Konuş<br>قسەبکە | Gül<br>پێبکەنە |

- **هەموو کارێك بە لێکردنەوەی پاشگری چاوگی (-mAk) لێی دەبێتە ڕەگ**. بۆ نمونە:

| **Mastar<br>چاوگ** | Gitmek | Gelmek | Yazmak | Ağlamak |
|---|---|---|---|---|
| **Kök<br>ڕەگ** | Git- | Gel- | Yaz- | Ağla- |

٢- **کەسی دووەمی کۆ (Siz): دوو جۆرە پاشگر وەردەگرێت (-In) و (-InIz)** هەرکامێکیان دابنرێت هیچ جیاوازیەکیان نیە و هەمان مانایان هەیە، بەڵام **بەگشتی پاشگری (-In) بۆ ئاخاوتن بەکاردێت و پاشگری (-InIz)یش بۆ نووسین و ئاخاوتنی فەرمی**، شێوەی دەرکەوتنیشیان بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی دەگۆڕێت.

| a,ı | **-ın/-ınız** | Yap**ın** | بکەن | Çık**ınız** | دەرچن |
|---|---|---|---|---|---|
| e,i | **-in/-iniz** | Gid**in** | بڕۆن | İt**iniz** | پاڵدەن |
| o,u | **-un/-unuz** | Okuy**un** | بخوێننەوە | Konuş**unuz** | قسەبکەن |
| ö,ü | **-ün/-ünüz** | Gül**ün** | پێبکەنن | Gör**ünüz** | ببینن |

٣- **کەسی سێیەمی تاك (O): پاشگری (sIn-) وەردەگرێت** و بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی **بەچوار** شێوە دەردەکەوێت.

| a,ı | **-sın** | Yap**sın** | با بکات | Çık**sın** | با دەرچێت |
|---|---|---|---|---|---|
| e,i | **-sin** | Git**sin** | بابڕوات | Gel**sin** | با بێت |
| o,u | **-sun** | Oku**sun** | بابخوێنێتەوە | Konuş**sun** | باقسەبکات |
| ö,ü | **-sün** | Gül**sün** | باپێبکەنێت | Gör**sün** | با ببینێت |

٤- **کەسی سێیەمی کۆ (Onlar): هەردوو پاشگری (sIn-) و (sInlAr-) وەردەگرێ، لەڕووی ماناشەوە هیچ جیاوازیەکیان نیە**، بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگیش دەگۆڕێن.

| a,ı | **-sın**<br>**-sınlar** | Yap**sın** | با بکەن | Çık**sınlar** | با دەرچن |
|---|---|---|---|---|---|
| e,i | **-sin**<br>**-sinler** | Git**sin** | با بڕۆن | Gel**sinler** | با بێن |
| o,u | **-sun**<br>**-sunlar** | Oku**sun** | با بخوێننەوە | Konuş**sunlar** | باقسەبکەن |
| ö,ü | **-sün**<br>**-sünler** | Gül**sün** | با پێبکەنن | Gör**sünler** | با ببینن |

- حاڵەتەکانی شێوازی فەرمانی (Emir Kipi):

**هەردوو کەسی دووەمی تاك و کۆ (Sen/Siz) تەنها حاڵەتی ئەرێ و نەرێیان هەیە، پرسیاری ئەرێ و پرسیاری نەرێیان نیە.**

| کەسەکان | ئەرێ olumlu | نەرێ olumsuz | پرسیاری ئەرێ olumlu soru | پرسیاری نەرێ olumsuz soru |
|---|---|---|---|---|
| Sen | Gel<br>وەرە | Gelme<br>مەیە | --- | --- |
| Siz | Gelin<br>Geliniz<br>وەرن | Gelmeyin<br>Gelmeyiniz<br>مەیەن | --- | --- |
| O | Gelsin<br>با بێت | Gelmesin<br>با نەیەت | Gelsin mi?<br>ئایا بێت؟ | Gelmesin mi?<br>ئایا نەیەت؟ |
| Onlar | Gelsin<br>Gelsinler<br>با بێن | Gelmesin<br>Gelmesinler<br>با نەیەن | Gelsin mi?<br>Gelsinler mi?<br>ئایا بێن؟ | Gelmesin mi?<br>Gelmesinler mi?<br>ئایا نەیەن؟ |

- ئەرکەکانی شێوازی فەرمانی (Emir Kipi -İşlev):

١- **فەرمان کردن** (Emir, Buyruk):

| | |
|---|---|
| Hemen anneni ara. | یەکسەر تەلەفۆن بۆ دایکت بکە. |
| Dışarı çıkın. | بڕۆنە دەرەوە. |
| Çabuk odasını toplasın. | با خێرا ژوورەکەی کۆ بکاتەوە. |
| Hızlıca gelsinler. | با بەخێرایی بێن. |

٢- **ویستن و تکاکردن** (İstek, Rica):

| | |
|---|---|
| Lütfen yüksek sesle konuşmayın. | تکایە بە دەنگی بەرز قسە مەکەن. |
| Lütfen parayı alın. | تکایە پارەکە ببەن. |
| Lütfen bana yardım edin. | تکایە یارمەتیم بدەن. |

**٣- قەدەغە و ئاگاداری** (Yasak, Uyarı):

| Kapalı alanda sigara içmeyiniz! | لە شوێنی داخراودا جگەرە مەکێشن! |
|---|---|
| İçeri girmeyiniz! | مەیەنە ژوورەوە! |
| Ateşten uzak dur! | لە ئاگر بەدوور بە! |
| Park yapmayınız! | ئۆتۆمبێل ڕامەگرن! |
| Gürültü Yapmayınız! | ژاوەژاو دروست مەکەن! |

**٤- نزای چاك و نزای خراپ** (Dua & Beddua):

| Allah'a emanet olun. | سپاردەی خودا بن. |
|---|---|
| Allah korusun. | خودا بیپارێزێ / خوا نەکا |
| Allah şifa versin. | خودا شیفای بدات. |
| Allah yardımcınız olsun. | خودا یارمەتیدەرتان بێت. |
| Allah rahmet eylesin. | خودا ڕەحمی پێ بکات. |
| Mekanı cennet olsun. | جێگای بەهەشت بێت. |
| Allah razı olsun. | خودا لێت ڕازی بێت. |
| Allah kahretsin. | خودا لەناوت بات. |
| Allah cezasını versin. | خودا سزای بدات. |
| Allah kavuştursun. | خودا بەیەکتان شاد بکاتەوە. |
| Başın sağ olsun. | خۆتان خۆش بن. |
| Hoşça kalın. | بەخێر بمێنن. |
| Hayırlı olsun. | سەر بەخێر بێت. |
| Yolunuz açık olsun. | ڕێگاتان ڕوون بێت. |

- شـێوازی پێویسـتی (Gereklilik Kipi) و جۆرەکـانی ڕسـتەی پێویستی.

جۆری یەکەم/ شێوازی پێویستی (دەبێ، نابێ) (**-malı/-meli**)

- **ئەم شێوازە تەنها لەگەڵ فرمان(fiil) دێت** و لەگەڵ ناو(isim) نایەت.

- ڕستەی پێویستی جۆری (malı/meli): **بۆ قسەکردنە لەسەر پێویست بـوونی کردنـی شتێك و بەمانای (دەبێ) دێت**.

| یاسای حاڵەتەکانی شێوازی پێویستی (kurallar) | |
|---|---|
| Fiil + -mAlI + şahıs eki | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| Fiil + -mA + -mAlI + şahıs eki | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| Fiil + -mAlI + mI + şahıs eki ? | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| Fiil + -mA + -mAlI + mI + şahıs eki ? | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

- پاشگری شێوازی پێویستی (-mAlI) بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگـی دوانـەیی **بـە دوو شێوە دەردەکەوێ** کە بریتین لە (**malı**) و (**meli**).

- حاڵەتەکانی شێوازی پێویستی (Gereklilik Kipi):

یەکەم/ حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu):

| کەسەکان | **Fiil + -mAlI + şahıs eki** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gel**meli**yim | دەبێ بێم | Yaz**malı**yım | دەبێ بنووسم |

| Sen | Gel**meli**sin | دەبێ بێیت | Yaz**malı**sın | دەبێ بنووسیت |
|---|---|---|---|---|
| O | Gel**meli** | دەبێ بێت | Yaz**malı** | دەبێ بنووسێ |
| Biz | Gel**meli**yiz | دەبێ بێین | Yaz**malı**yız | دەبێ بنووسین |
| Siz | Gel**meli**siniz | دەبێ بێن | Yaz**malı**sınız | دەبێ بنووسن |
| Onlar | Gel**meli**<br>Gel**meli**ler | دەبێ بێن | Yaz**malı**<br>Yaz**malı**lar | دەبێ بنووسن |

- دووەم/ حاڵەتی **نەرێ** (olumsuz):

| کەسەکان | **Fiil + -mA + -mAlI + şahıs eki** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gel**memeli**yim | نابێ بێم | Yaz**mamalı**yım | نابێ بنووسم |
| Sen | Gel**memeli**sin | نابێ بێیت | Yaz**mamalı**sın | نابێ بنووسیت |
| O | Gel**memeli** | نابێ بێت | Yaz**mamalı** | نابێ بنووسێت |
| Biz | Gel**memeli**yiz | نابێ بێین | Yaz**mamalı**yız | نابێ بنووسین |
| Siz | Gel**memeli**siniz | نابێ بێن | Yaz**mamalı**sınız | نابێ بنووسن |
| Onlar | Gel**memeli**<br>Gel**memeli**ler | نابێ بێن | Yaz**mamalı**<br>Yaz**mamalı**lar | نابێ بنووسن |

- سێیەم/ **پرسیاری ئەرێ** (olumlu soru):

| کەسەکان | **Fiil + -mAlI + mI + şahıs eki ?** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelmeli miyim? | دەبێ بێم؟ | Yazmalı mıyım? | دەبێ بنووسم؟ |
| Sen | Gelmeli misin? | دەبێ بێیت؟ | Yazmalı mısın? | دەبێ بنووسیت؟ |

| O | Gelmeli mi? | دەبێ بێت؟ | Yazmalı mı? | دەبێ بنووسێت؟ |
|---|---|---|---|---|
| Biz | Gelmeli miyiz? | دەبێ بێین؟ | Yazmalı mıyız? | دەبێ بنووسین؟ |
| Siz | Gelmeli misiniz? | دەبێ بێن؟ | Yazmalı mısınız? | دەبێ بنووسن؟ |
| Onlar | Gelmeli mi? Gelmeliler mi? | دەبێ بێن؟ | Yazmalı mı? Yazmalılar mı? | دەبێ بنووسن؟ |

چوارەم/ حاڵەتی **پرسیاری نەرێ** (olumsuz soru):

| کەسەکان | **Fiil + -mA + -mAlI + mI + şahıs eki ?** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelmemeli miyim? | نابێ بێم؟ | Yazmamalı mıyım? | نابێ بنووسم؟ |
| Sen | Gelmemeli misin? | نابێ بێیت؟ | Yazmamalı mısın? | نابێ بنووسیت؟ |
| O | Gelmemeli mi? | نابێ بێت؟ | Yazmamalı mı? | نابێ بنووسێت؟ |
| Biz | Gelmemeli miyiz? | نابێ بێین؟ | Yazmamalı mıyız? | نابێ بنووسین؟ |
| Siz | Gelmemeli misiniz? | نابێ بێن؟ | Yazmamalı mısınız? | نابێ بنووسن؟ |
| Onlar | Gelmemeli mi? Gelmemeliler mi? | نابێ بێن؟ | Yazmamalı mı? Yazmamalılar mı? | نابێ بنووسن؟ |

- ئەرکەکانی شێوازی پێویستی (Gereklilik Kipi -İşlev):

١- **پێویستی** (gereklilik, ihtiyaç):

| Yarın sınavım var ders çalışmalıyım.<br>بەیانی تاقیکردنەوەم هەیە دەبێ دەرس بخوێنم. |
|---|
| Hava soğuk, daha kalın giyinmelisin.<br>هەوا ساردە پێویستە ئەستورتر بپۆشیت. |
| Biraz daha zayıflamalıyız.<br>دەبێ کەمێکی تر لاواز بین. |
| Çok yoruldunuz, dinlenmelisiniz.<br>زۆر ماندووبوونە، دەبێ بحەسێنەوە. |

٢- **ناچاریی** (zorunluluk, mecburiyet):

| Ellerim kirlendi, hemen lavaboya gitmeliyim.<br>دەستەکانم پیس بوون، دەبێ یەکسەر بچمە دەستشۆر. |
|---|
| Geç kaldık evi aramalıyız.<br>درەنگ کەوتین دەبێ تەلەفۆن بۆماڵەوە بکەین. |
| Derse tam zamanında girmelisiniz.<br>دەبێ لەکاتی خۆیدا بێنە دەرسەوە. |
| Ödevi hocana teslim etmelisin.<br>دەبێ ئەرکەکان تەسلیمی مامۆستاکەت بکەی. |

٣- **خەملاندن** (tahmin, olasılık, ihtimal):

| Kapıda biri var postacı olmalı.<br>یەکێك لەبەردەرگایە، دەبێ پۆستەچی بێت. |
|---|
| Anahtarım yok, iş yerimde olmalı.<br>کلیلم لەلا نیە، دەبێ لەشوێنی کارەکەم بێت. |

٤- **ڕاسپاردە، ئامۆژگاری، پێشنیار** (tavsiye, nasihat, öneri):

| Her gün en az bir Türkçe filmi izlemelisin.<br>هەموو ڕۆژێك دەبێ لایەنی کەم سەیری فلیمێکی تورکی بکەی. |
|---|
| Daha erken faturanızı ödemelisiniz.<br>دەبێ زووتر پارەی فاتورەکەتان بدەن. |

## جۆری دووەم/ دەبێ ڕوویدابێت (**-mIş + olmalı**)

| **Fiil + -mIş + olmalı + şahıs eki** |
|---|
| Bugün Ali eve gel**miş olmalı**.<br>دەبێ ئەمڕۆ عەلی هاتبێتە ماڵەوە. |
| Runa işlerini bitir**miş olmalı**.<br>دەبێ ڕوونە کارەکانی تەواو کردبێت. |
| Koridor sessiz, herkes derse gir**miş olmalı**.<br>ڕاڕەوەکە بی دەنگە، دەبێ هەموان چووبنە پۆلەوە. |
| Sen çok acık**mış olmalı**sın, hemen yemek hazırlayayım.<br>تۆ دەبێ زۆر برسی بیت، با یەکسەر خواردن ئامادە بکەم. |
| Uçak çoktan Erbil’e in**miş olmalı**.<br>دەبێ لەمێژبێت فڕۆکەکە لە هەولێر نیشتبێتەوە. |

## جۆری سێیەم/ پێویستیم پێ هەیە، نیە (**ihtiyaç , gereksinim**)

**Fiil + -mAyA + ihtiyaç/gereksinim + iyelik eki + var/yok.**

| |
|---|
| Çok yorgunum, uyu**maya ihtiyacım var**.<br>زۆر ماندووم، پێویستیم بە خەوتنە. |
| Biraz daha dinlen**meye ihtiyacım var**.<br>کەمێکی تر پێویستیم بە حەسانەوەیە. |
| Namaz kılmak için abdest al**maya gereksinim var**.<br>بۆ نوێژکردن پێویستیم بە دەستنوێژگرتنە. |
| Artık çalış**maya ihtiyacım yok**.<br>چیتر پێویستیم بە کارکردن نیە. |
| Çok tokum, yemek ye**meye ihtiyacım yok**.<br>زۆر تێرم، پێویستیم بە نان خواردن نیە. |

## جۆری چوارەم/ پێویستە، پێویست نیە (**gerek , lazım**):

| | |
|---|---|
| Fiil + -mA + iyelik eki + gerek/lazım. | ئەرێ |
| Fiil + -mA + iyelik eki + gerekli değil. | نەرێ |
| Fiil + -mA + iyelik eki + gerekli mi ? | پرسیاری ئەرێ |
| Fiil + -mA + iyelik eki + gerekli değil mi ? | پرسیاری نەرێ |

یەکەم/ حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu):

| İyelik eki |
|---|
| -Im |
| -In |
| -I |
| -ImIz |
| -InIz |
| -I<br>-lArI |

| **Fiil + -mA + iyelik eki + gerek/lazım.** | |
|---|---|
| Benim gel**mem gerek**. | هاتنی من پێویستە. |
| Senin gel**men lazım**. | هاتنی تۆ پێویستە. |
| Onun gel**mesi gerek**. | هاتنی ئەو پێویستە. |
| Bizim gel**memiz lazım**. | هاتنی ئێمە پێویستە. |
| Sizin gel**meniz gerek**. | هاتنی ئێوە پێویستە. |
| Onların gel**meleri lazım**. | هاتنی ئەوان پێویستە. |

دووەم/ حاڵەتی **نەرێ** (olumsuz):

| **Fiil + -mA + iyelik eki + gerekli değil.** | |
|---|---|
| Benim gel**mem gerekli değil**. | هاتنی من پێویست نیە. |
| Senin gel**men gerekli değil.** | هاتنی تۆ پێویست نیە. |
| Onun gel**mesi gerekli değil.** | هاتنی ئەو پێویست نیە. |
| Bizim gel**memiz gerekli değil.** | هاتنی ئێمە پێویست نیە. |
| Sizin gel**meniz gerekli değil.** | هاتنی ئێوە پێویست نیە. |
| Onların gel**meleri gerekli değil.** | هاتنی ئەوان پێویست نیە. |

سێیەم/ **پرسیاری ئەرێ** (olumlu soru):

| **Fiil + -mA + iyelik eki + gerekli mi ?** | |
|---|---|
| Benim gel**mem gerekli mi**? | هاتنی من پێویستە؟ |
| Senin gel**men gerekli mi**? | هاتنی تۆ پێویستە؟ |
| Onun gel**mesi gerekli mi**? | هاتنی ئەو پێویستە؟ |
| Bizim gel**memiz gerekli mi**? | هاتنی ئێمە پێویستە؟ |
| Sizin gel**meniz gerekli mi**? | هاتنی ئێوە پێویستە؟ |
| Onların gel**meleri gerekli mi**? | هاتنی ئەوان پێویستە؟ |

چوارەم/ **پرسیاری نەرێ** (olumsuz soru):

| **Fiil + -mA + iyelik eki + gerekli değil mi ?** | |
|---|---|
| Benim gelmem **gerekli değil mi**? | هاتنی من پێویست نیە؟ |
| Senin gelmen **gerekli değil mi**? | هاتنی تۆ پێویست نیە؟ |
| Onun gelmesi **gerekli değil mi**? | هاتنی ئەو پێویست نیە؟ |
| Bizim gelmemiz **gerekli değil mi**? | هاتنی ئێمە پێویست نیە؟ |
| Sizin gelmeniz **gerekli değil mi**? | هاتنی ئێوە پێویست نیە؟ |
| Onların gelmeleri **gerekli değil mi**? | هاتنی ئەوان پێویست نیە؟ |

## جۆری پێنجەم/ پێویستە، پێویست نیە (**gerek var, gerek yok**)

| | |
|---|---|
| Fiil + -mA + iyelik eki + -A + gerek yok | نەرێ |
| Fiil + -mA + iyelik eki + -A + gerek var mı ? | پرسیاری ئەرێ |
| Fiil + -mA + iyelik eki + -A + gerek yok mu ? | پرسیاری نەرێ |

یەکەم/ حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu):

| **Fiil + -mA + iyelik eki + -A + gerek yok.** | |
|---|---|
| Benim gel**meme gerek yok**. | پێویست بە هاتنی من ناکات. |
| Senin gel**mene gerek yok**. | پێویست بە هاتنی تۆ ناکات. |
| Onun gel**mesine gerek yok**. | پێویست بە هاتنی ئەو ناکات. |
| Bizim gel**memize gerek yok**. | پێویست بە هاتنی ئێمە ناکات. |
| Sizin gel**menize gerek yok**. | پێویست بە هاتنی ئێوە ناکات. |
| Onların gel**melerine gerek yok**. | پێویست بە هاتنی ئەوان ناکات. |

دووەم/ **پرسیاری ئەرێ** (olumlu soru):

| **Fiil + -mA + iyelik eki + -A + gerek var mı ?** | |
|---|---|
| Benim gel**meme gerek var mı**? | پێویست بە هاتنی من دەکات؟ |
| Senin gel**mene gerek var mı**? | پێویست بە هاتنی تۆ دەکات؟ |
| Onun gel**mesine gerek var mı**? | پێویست بە هاتنی ئەو دەکات؟ |
| Bizim gel**memize gerek var mı**? | پێویست بە هاتنی ئێمە دەکات؟ |

| Sizin gel**menize gerek var mı**? | پێویست بە هاتنی ئێوە دەکات؟ |
|---|---|
| Onların gel**melerine gerek var mı**? | پێویست بە هاتنی ئەوان دەکات؟ |

سێیەم/ **پرسیاری نەرێ** (olumsuz soru):

| **Fiil + -mA + iyelik eki + -A + gerek yok mu ?** | |
|---|---|
| Benim gelmeme **gerek yok mu**? | پێویست بە هاتنی من ناکات؟ |
| Senin gelmene **gerek yok mu**? | پێویست بە هاتنی تۆ ناکات؟ |
| Onun gelmesine **gerek yok mu**? | پێویست بە هاتنی ئەو ناکات؟ |
| Bizim gelmemize **gerek yok mu**? | پێویست بە هاتنی ئێمە ناکات؟ |
| Sizin gelmenize **gerek yok mu**? | پێویست بە هاتنی ئێوە ناکات؟ |
| Onların gelmelerine **gerek yok mu**? | پێویست بە هاتنی ئەوان ناکات؟ |

## جۆری شەشەم/ پێویستە دەکات؟ پێویست ناکات؟

ئەم جۆرەیان **بۆ پرسیارکردن لە شتی گشتی بەکاردێت** نەك بۆ کەسەکان.

| Fiil + -mAyA + gerek var mı ? | پرسیاری ئەرێ |
|---|---|
| Fiil + -mAyA + gerek yok mu ? | پرسیاری نەرێ |

| Su iç**meye gerek** var mı? | پێویست بە ئاو خواردنەوە دەکات؟ |
|---|---|
| Pazara git**meye gerek** yok mu? | پێویست بە چوونە بازاڕ ناکات؟ |

| | |
|---|---|
| Kitap oku**maya gerek** var mı? | پێویست بە کتێب خوێندنەوە دەکات؟ |
| Dışarı git**meye gerek** yok mu? | پێویست بە چوونە دەرەوە ناکات؟ |
| Onayla**maya gerek** yok mu? | پێویست بە ڕەزامەندی ناکات؟ |

## جۆری حەوتەم/ ناچاریی (**zorunluluk , mecburiyet**)

| **Zorunluluk** | |
|---|---|
| Fiil + -mAk + zorunda + iyelik eki. | ئەرێ |
| Fiil + -mAk + zorunda + değil + iyelik eki. | نەرێ |
| Fiil + -mAk + zorunda + mI + iyelik eki ? | پرسیاری ئەرێ |
| Fiil + -mAk + zorunda + değil + mI + iyelik eki? | پرسیاری نەرێ |

| **Mecburiyet** | |
|---|---|
| Fiil + -mAyA + mecbur + iyelik eki. | ئەرێ |
| Fiil + -mAyA + mecbur + değil + iyelik eki. | نەرێ |
| Fiil + -mAyA + mecbur + mI + iyelik eki ? | پرسیاری ئەرێ |
| Fiil + -mAyA + mecbur + değil + mI + iyelik eki? | پرسیاری نەرێ |

تێبینی: هەردووکیان هەمان مانایان هەیە، تەنها لەڕووی ڕێزمان و دەربڕینەوە جیاوازن.

| حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu) |
|---|
| **Fiil + -mAk + zorunda + iyelik eki**<br>**Fiil + -mAyA + mecbur + iyelik eki** |

| Ben ödevleri yap**mak zorunda**yım.<br>من ناچارم ئەرکەکان جێ بەجێ بکەم. |
|---|
| Sen spor yap**mak zorunda**sın.<br>تۆ ناچاریت وەرزش بکەیت. |
| Her gün çalış**mak zorunda**dır.<br>ناچارە هەموو ڕۆژێك کار بکات. |
| Bir otel bul**maya mecbur**uz.<br>ناچارین ئوتێلێك بدۆزینەوە. |
| Faturaları öde**meye mecbur**sunuz.<br>ناچارن پارەی فاتورەکان بدەن. |
| Ehliyet al**maya mecbur**lardır.<br>(ئەوان) ناچارن مۆڵەتی شوفێری وەربگرن. |

| حاڵەتی **نەرێ** (olumsuz) |
|---|
| **Fiil + -mAk + zorunda + değil + iyelik eki.**<br>**Fiil + -mAyA + mecbur + değil + iyelik eki.** |
| Ben ödevleri yap**mak zorunda** değilim.<br>من ناچارنیم ئەرکەکان جێ بەجێ بکەم. |
| Sen spor yap**mak zorunda** değilsin.<br>تۆ ناچارنیت وەرزش بکەیت. |
| Her gün çalış**mak zorunda** değildir.<br>ناچارنیە هەموو ڕۆژێك کار بکات. |
| Araba sür**meye mecbur** değiliz.<br>(ئێمە) ناچارنین ئۆتۆمبێل لێبخورین. |
| Faturaları öde**meye mecbur** değilsiniz.<br>(ئێوە) ناچارنین پارەی فاتورەکان بدەن. |

| (olumlu soru) **پرسیاری ئەرێ** |
|---|
| **Fiil + -mAk + zorunda + mI + iyelik eki ?**<br>**Fiil + -mAyA + mecbur + mI + iyelik eki ?** |
| Ben ödevleri yap**mak zorunda** mıyım?<br>ئایا من ناچارم ئەرکەکان جێ بەجێ بکەم؟ |
| Sen spor yap**mak zorunda** mısın?<br>ئایا تۆ ناچاریت وەرزش بکەیت؟ |
| Her gün çalış**mak zorunda** mı?<br>ئایا ناچارە هەموو ڕۆژێك كار بكات؟ |
| Ona yardım et**meye mecbur** muyuz?<br>ئایا ناچارین یارمەتی ئەو بدەین؟ |
| Faturalar öde**meye mecbur** musunuz?<br>ئایا ناچارن پارەی فاتورەکان بدەن؟ |

| (olumsuz soru) حاڵەتی پرسیاری نەرێ |
|---|
| **Fiil + -mAk + zorunda + değil + mI + iyelik eki ?**<br>**Fiil + -mAyA + mecbur + değil + mI + iyelik eki ?** |
| Ben ödevleri yap**mak zorunda** değil miyim?<br>ئایا من ناچارنیم ئەرکەکان جێ بەجێ بکەم؟ |
| Sen spor yap**mak zorunda** değil misin?<br>ئایا تۆ ناچارنیت وەرزش بکەیت؟ |
| Her gün çalış**mak zorunda** değil mi?<br>ئایا ناچارنیە هەموو ڕۆژێك كار بكات؟ |
| Ona yardım et**meye mecbur** değil miyiz?<br>ئایا ناچارنین یارمەتی ئەو بدەین؟ |
| Faturaları öde**meye mecbur** değil misiniz?<br>ئایا ناچارنین پارەی فاتورەکان بدەن؟ |

## • شێوازی مەرجی (Şart Kipi)

- لەنێو چوار شێوازەکەی زمانی تورکی تەنها ئـەوەیان **هەم لەگـەڵ فرمـان(fiil) و هـەم لەگەڵ ناو(isim) بەکاردێت**.

- شـێوازی مـەرجی (şart kipi) **لـەڕێگای پاشـگری (-sa/-se) وە مـەرج و خۆزگـە دادەنێتە سەر فرمان و ناو** وەك (ئەگەر بچم، خۆزگە بچم) (ئەگـەر مامۆسـتابم، خۆزگـە مامۆستابم)، ئەم پاشگرەش بەپێی یاسای هەماهـەنگی دەنگـی دووانـەیی **بـەدوو شـێوە دەردەکەوێ (sa/se)**.

- لەگەڵ فرمان (Fiil):

| یاسای حاڵەتەکانی شێوازی مەرجی،ڕستەی فرمانی (kurallar) | |
|---|---|
| Fiil + -sA + şahıs eki. | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| Fiil + -mA + -sA + şahıs eki. | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| Fiil + -sA + şahıs eki + mI ? | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| Fiil + -mA + -sA + şahıs eki + mI? | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

تێبینی: جێناوە کەسیەکان لـە شـێوازی مەرجیـدا وەك جێنـاوە کەسـیەکانی (ڕابـردووی بینراو- görülen geçmiş zaman) دەبێت وەك لەم خشتەیەدا هاتووە:

| şahıs eki | | | |
|---|---|---|---|
| Ben | -m | Biz | -k |
| Sen | -n | Siz | -nIz |
| O | - | Onlar | - / -lAr |

یەکەم/ حاڵەتی **ئەرێ** (olumlu):

| کەسەکان | **Fiil + -sA + şahıs eki** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelsem | بێم | Yazsam | بنووسم |
| Sen | Gelsen | بێیت | Yazsan | بنووسیت |
| O | Gelse | بێت | Yazsa | بنووسێت |
| Biz | Gelsek | بێین | Yazsak | بنووسین |
| Siz | Gelseniz | بێن | Yazsanız | بنووسن |
| Onlar | Gelse<br>Gelseler | بێن | Yazsa<br>Yazsalar | بنووسن |

دووەم/ حاڵەتی **نەرێ** (olumsuz)

| کەسەکان | **Fiil + -mA + -sA + şahıs eki.** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelmesem | نەیەم | Yazmasam | نەنووسم |
| Sen | Gelmesen | نەیەیت | Yazmasan | نەنووسیت |
| O | Gelmese | نەیەت | Yazmasa | نەنووسێت |
| Biz | Gelmesek | نەیەین | Yazmasak | نەنووسین |
| Siz | Gelmeseniz | نەیەن | Yazmasanız | نەنووسن |
| Onlar | Gelmese<br>Gelmeseler | نەیەن | Yazmasa<br>Yazmasalar | نەنووسن |

سێیەم/ **پرسیاری ئەرێ** (olumlu soru)

| کەسەکان | **Fiil + -sA + şahıs eki + mI ?** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelsem mi? | بێم؟ | Yazsam mı? | بنووسم؟ |
| Sen | Gelsen mi? | بێیت؟ | Yazsan mı? | بنووسیت؟ |
| O | Gelse mi? | بێت؟ | Yazsa mı? | بنووسێت؟ |
| Biz | Gelsek mi? | بێین؟ | Yazsak mı? | بنووسین؟ |
| Siz | Gelseniz mi? | بێن؟ | Yazsanız mı? | بنووسن؟ |
| Onlar | Gelse mi?<br>Gelseler mi? | بێن؟ | Yazsa mı?<br>Yazsalar mı? | بنووسن؟ |

چوارەم/ **پرسیاری نەرێ** (olumsuz soru)

| کەسەکان | **Fiil + -mA + -sA + şahıs eki + mI ?** | | | |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelmesem mi? | نەیەم؟ | Yazmasam mı? | نەنووسم؟ |
| Sen | Gelmesen mi? | نەیەیت؟ | Yazmasan mı? | نەنووسیت؟ |
| O | Gelmese mi? | نەیەت؟ | Yazmasa mı? | نەنووسێت؟ |
| Biz | Gelmesek mi? | نەیەین؟ | Yazmasak mı? | نەنووسین؟ |
| Siz | Gelmeseniz mi? | نەیەن؟ | Yazmasanız mı? | نەنووسن؟ |
| Onlar | Gelmese mi?<br>Gelmeseler mi? | نەیەن؟ | Yazmasa mı?<br>Yazmasalar mı? | نەنووسن؟ |

- ئەرکەکانی شێوازی مەرجی (Şart kipi):

١- **مەرج دانان** (şart, koşul):

| Çok param olsa yeni araba alırım.<br>پارەم زۆربێت ئۆتۆمبێلێکی نوێ دەکڕم. |
|---|
| Babam gelse çok mutlu oluyorum.<br>باوکم بێت زۆر دڵخۆش دەبم. |
| Eğer bir çocuk ağlasa üzülürüm.<br>ئەگەر منداڵێك بگریت دڵتەنگ دەبم. |
| İşimi yapmasam gelemem.<br>کارەکەم نەکەم ناتوانم بێم. |
| Şayet Türkiye’ye gelsem seni ararım.<br>ئەگەر بێمە تورکیا تەلەفۆنت بۆ دەکەم. |

کاتێ ووشەکانی (**Eğer / Şayet**) لە ڕستەدا هەبن موتڵەقەن ئەرکی ڕستەکە **مەرجیە**.

٢- **خۆزگە خواستن** (keşke + -sA):

| Keşke ailem de burada olsa.<br>خۆزگە خێزانەکەشم لێرەبن. |
|---|
| Keşke dünyada hiç savaş olmasa.<br>خۆزگە لەدونیا هیچ شەڕ نەبێت. |
| Keşke Ali gibi cesur olsak.<br>خۆزگە وەك عەلی ئازابین. |
| Keşke herkes mutlu olabilse.<br>خۆزگە هەموو کەسێك بتوانێ دڵخۆش بێت. |
| Keşke ben de uçak kullanabilsem!<br>خۆزگە منیش بتوانم فڕۆکە لێبخورِم. |

- لـــەو ئەرکەیـــدا ووشـــەی (**خۆزگـــە-keşke**) بـــەکاردێت. **لەهـــەر ڕستەیەکیشـــدا ووشەی(keşke) هەبێ تەنها یـەك فرمـان دێـت**. ئەگـەر لەهـەمان ڕسـتەدا (keşke) لابردرێت **پێویست بە دانانی فرمانێکی تر دەکات** تا مانای ڕستەکە تەواو ببێت.

| | |
|---|---|
| Keşke şimdi Erbil’e gitsem. | خۆزگە ئێستا بچمە هەولێر. |
| Şimdi Erbil’e gitsem dolma yerim. | ئێستا بچمە هەولێر دۆڵمە دەخۆم. |

٣- **بێ قەراری** (kararsızlık):

| | |
|---|---|
| Sinemaya gitsem mi? | بچمە سینەما؟ |
| Yemek yesek mi? | نان بخۆین؟ |
| Sırını söylesem mi? | نهێنیەکەی بڵێم؟ |

٤- **قالبی بێ بایەخ کردن** (etkisizlik kalıbı): لێرەدا ڕستە بەشێوەیەك دادەڕێـژرێت کە هیچ گرنگیەك بۆ کرداری رستەکە ناهێڵێتەوەو بێ بایەخ نیشانی دەدات.

| **Fiil + -sA + dA + Fiil + -mAsA + dA ...** |
|---|
| Ali gel**se de** gel**mese de** sorun yok.<br>عەلی بێت و نەیەت کێشە نیە. |
| İzin ver**seler de** verme**seler de** Irak’a dönerim.<br>مۆڵەت بدەن و نەدن دەگەڕێمەوە عێراق. |
| Bana inan**san da** inan**masan da** durum bu.<br>باوەڕم پێ بکەیت و نەکەیت دۆخەکە ئاوایە. |
| Spor yap**sam da** yap**masam da** kilom değişmez.<br>وەرزش بکەم و نەکەم کێشم ناگۆڕێت. |

- لەگەڵ ناو (İsim):

| یاسای حاڵەتەکانی شێوازی مەرجی،ڕستەی ناویی (kurallar) | |
|---|---|
| İsim + (y) -sA + şahıs eki. | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| İsim + değil + -sA + şahıs eki. | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| İsim + (y) -sA + şahıs eki + mI ? | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| İsim+ değil+ -sA+ şahıs eki+ mI? | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

ئەگەر ناوێك كۆتایی هاتبوو بە پیتێكی دەنگی ئەوا لەحاڵەتی ئـەرێ و پرسـیاری ئەرێـدا **ناوبڕی (Y)** لەنێوان ناوەكە و پاشگری (-sa/-se) دادەنرێت.

- جێناوە كەسیەكان (şahıs eki) بەم شێوەیە دەبێت:

| Ben | -m |
|---|---|
| Sen | -n |
| O | - |
| Biz | -k |
| Siz | -nIz |
| Onlar | - / -lAr |

| كەسەكان | ئەرێ Olumlu | نەرێ Olumsuz | پرسیاری ئەرێ soru Olumlu | پرسیاری نەرێ Olumsuz soru |
|---|---|---|---|---|
| Ben من | Yazarsam نووسەربم | Yazar değilsem نووسەر نەبم | Yazarsam mı? نووسەر بم؟ | Yazar değilsem mi? نووسەرنەبم؟ |
| Sen تۆ | Yazarsan نووسەربیت | Yazar değilsen نووسەر نەبیت | Yazarsan mı? نووسەر بیت؟ | Yazar değilsen mi? نووسەرنەبیت؟ |
| O ئەو | Yazarsa نووسەربێت | Yazar değilse نووسەر نەبێت | Yazarsa mı? نووسەر بێت؟ | Yazar değilse mi? نووسەرنەبێت؟ |

| Biz<br>ئێمە | Yazarsak<br>نووسەربین | Yazar değilsek<br>نووسەر نەبین | Yazarsak mı?<br>نووسەر بین؟ | Yazar değilsek mi?<br>نووسەرنەبین؟ |
|---|---|---|---|---|
| Siz<br>ئێوە | Yazarsanız<br>نووسەربن | Yazar değilseniz<br>نووسەر نەبن | Yazarsanız mı?<br>نووسەر بن؟ | Yazar değilseniz mi?<br>نووسەرنەبن؟ |
| Onlar<br>ئەوان | Yazarsa<br>Yazarsalar<br>نووسەربن | Yazar değilse<br>Yazar değilseler<br>نووسەر نەبن | Yazarsa mı?<br>Yazarsalar mı?<br>نووسەر بن؟ | Yazar değilse mi?<br>Yazar değilseler mi?<br>نووسەرنەبن؟ |

## - ڕستەی مەرجی لێکدراو (Şart kipinin hikayesi):

لێرەدا **پاشگری(-sAydI) بەکاردەهێنرێت و مەرج دەخاتە سەر فرمان لە ڕابردوودا**، (لە ئاستی داهاتوو B٢ ئەو بابەتە بە ووردی دەخوێنرێت، بەڵام بەهۆی ئەوەی بەشێکە لە شێوازەکانی زمانی تورکی لێرە بەکورتی دەخرێتەڕوو تا قوتابی شارەزاییەکی سەرەتایی هەبێت لەسەری).

| یاسای حاڵەتەکانی شێوازی مەرجی لێکدراو (kurallar) | |
|---|---|
| Fiil + -sAydI + şahıs eki. | حاڵەتی ئەرێ (olumlu) |
| Fiil + -mA + -sAydI + şahıs eki. | حاڵەتی نەرێ (olumsuz) |
| Fiil + -sA + mIydI + şahıs eki ? | پرسیاری ئەرێ (olumlu soru) |
| Fiil + -mA + -sA + mIydI + şahıs eki ? | پرسیاری نەرێ (olumsuz soru) |

**<u>تێبینی</u>: هەرکاتێك ئەم شێوازە بەکارهات دەبێت دوو فرمان لە ڕستەکەدا هەبێت،** فرمانێکیان پاشگری (**-sAydI**) دەچێتە سەر و فرمانەکەی تر دەبێتە فرمانی بەردەوام (Birleşik Fiil) بێت (کە لە ئاستی داهاتوو دەخوێنرێت). جگە لەو ڕستانەی کە (keşke) یان تێدایە.

| کەسەکان | ئەرێ Olumlu | نەرێ Olumsuz | پرسیاری ئەرێ Olumlu soru | پرسیاری نەرێ Olumsuz soru |
|---|---|---|---|---|
| Ben | Gelseydim هاتبوومایە | Gelmeseydim نەهاتبوومایە | Gelse miydim? هاتبوومایە؟ | Gelmese miydim? نەهاتبوومایە؟ |
| Sen | Gelseydin هاتبوویتایە | Gelmeseydin نەهاتبوویتایە | Gelse miydin? هاتبوویتایە؟ | Gelmese miydin? نەهاتبوویتایە؟ |
| O | Gelseydi هاتبووایە | Gelmeseydi نەهاتبووایە | Gelse miydi? هاتبووایە؟ | Gelmese miydi? نەهاتبووایە؟ |
| Biz | Gelseydik هاتباین | Gelmeseydik نەهاتباین | Gelse miydik? هاتباین؟ | Gelmese miydik نەهاتباین؟ |
| Siz | Gelseydiniz هاتبان | Gelmeseydiniz نەهاتبان | Gelse miydiniz? هاتبان؟ | Gelmese miydiniz? نەهاتبان؟ |
| Onlar | Gelseydiler هاتبان | Gelmeseydiler نەهاتبان | Gelse miydiler? هاتبان؟ | Gelmese miydiler? نەهاتبان؟ |

- ئەرکەکانی شێوازی مەرجی لێکدراو :

١- **پەشیمان بوونەوە** (pişman olmak):

| |
|---|
| Sınava daha çok çalış**saydı**m yüksek puan al**ırdı**m.<br>بۆ تاقیکردنەوە زیاتر بمخوێندبووایە نمرەیەکی بەرزم دەهێنا. |
| keşke çalış**masaydı**m seninle geli**yordu**m.<br>خۆزگە کارم نەکردبووایە لەگەڵ تۆ دەهاتم. |
| **Keşke** seni hiç sevme**seydi**m.<br>خۆزگە تۆم هیچ خۆش نەویستبووایە. |

٢- **خۆزگە خواستن** (dilek):

| |
|---|
| Ali derse gel**seydi** bu kadar bık**mıyordu**k.<br>عەلی بهاتبووایە دەرس ئەوەندە بێزار نەدەبووین. |
| Kayseri'ye git**seydim** arkadaşlarımla görüş**ürdü**k.<br>بچووبووومایە قەیسەری لەگەڵ هاورێکانم یەکترمان دەبینی. |
| İstanbul'da ol**saydı**m gez**erdi**m.<br>لە ئیستەنبوڵ بوومایە دەگەڕام. |

٣- **ڕاوێژکردن، ڕا وەرگرتن** (istişare etmek, fikir almak):

| |
|---|
| Sence sinemaya gelmese miydik?<br>بەڕای تۆ نەچووباین بۆ سینەما؟ |
| Sizce dolmayı yemese miydim?<br>بەڕای ئێوە دۆڵمەکەم نەخواردبووایە؟ |
| Sence önce ne yapsaydık?<br>بەڕای تۆ سەرەتا چیمان بکردبووایە؟ |

- سیفاتەکان (ئاوەڵناو) (Sıfatlar)

**سیفاتەکان (ئاوەڵناوەکان) بۆ ڕوون کردنەوەی ناوەکان و نیشاندانی تایبەتمەندێتی بوونەوەرەکان(varlık) و شتەکان(şeyler)ن.** بۆ دروست بوونی سیفاتیش پێویستە (**Sıfat+İsim**) هەبێت، **بەبێ بوونی ناوێك لەدوای سیفاتەکە ئەوا سیفاتەکە خوودی خۆی دەبێتە ناوو ناتوانێ ڕۆڵی سیفەت بگێڕێ**، ئەمەش ڕەنگ، شێواز، ڕەهەند، ژمارە، ووشە ئاماژەکان، ئەندازە، ووشە پرسەکان دەگرێتەوە.

تێبینی:

١- پێویستە سیفات لەپێش ناوەوە بێت (**Sıfat + İsim**) (لەزمانی کوردی بەپێچەوانەوەیە):

| Kırmızı kalem | قەلەمە سوورەکە |
|---|---|
| Küçük çocuk | منداڵە بچووکەکە |
| Uzak şehir | شارە دوورەکە |
| Bu adam | ئەو پیاوە |
| Birkaç asker | چەند سەربازێك |

٢- دەشێ چەند سیفاتێك بۆ یەك ناو بەکاربێن:

| **Büyük**, **sarı** ve **doğal** elma.<br>سێوە گەورەو زەرد و سروشتیەکە. |
|---|
| **İri**, **güçlü** ve **merhametli** adam.<br>پیاوە گەورە و بەهێز و میهرەبانەکە. |
| **Kötü** ve **kirli** araba.<br>ئۆتۆمبێلە پیس و خراپەکە. |

٣- دەشێ سیفات ببێتە ناو، **ئەویش بە لادانی ناوەکەی دوای سیفاتەکە:**

| **Genç** çay içti.<br>گەنجەکە چای خواردەوە. | **Genç** adam çay içti.<br>پیاوە گەنجەکە چای خواردەوە. |
| --- | --- |
| **Zengine** döviz verdim.<br>دراوی بیانیم دایە دەوڵەمەندەکە. | **Zengin** adama döviz verdim.<br>دراوی بیانیم دایە پیاوە دەوڵەمەندەکە. |

**- جۆرەکانی سیفات لە زمانی تورکیدا**

١- سیفاتی چۆنیەتی (Niteleme S.)

٢- سیفاتی ڕوون کردنەوە (Belirtme S.)

A- سیفاتی ئاماژە (İşaret S.)

B- سیفاتی ژمارەیی (Sayı S.)

١- ژمارە تەواوەکان (Asıl Sayı S.)

٢- ڕیزبەندیی (Sıra Sayı S.)

٣- دابەشکاریی (Üleştirme “Grup” Sayı S.)

٤- کەرتەکان (Kesir Sayı S.)

C- سیفاتی ناڕوونی (Belirsizlik S.)

D- سیفاتی پرس (Soru S.)

**یەکەم/ سیفاتی چۆنیەتی (Niteleme Sıfatları)**: ئەم جۆرە سیفاتە **جۆرو خاسیەتی بوونەوەرەکان دەردەخات و وەڵامی پرسیاری چۆن؟ (Nasıl?) دەداتەوە.**

ئەمەش بوارەکانی: ڕەنگ، شێوە، ڕەهەند، دۆرخ، دۆخی دەروونی، تایبەتمەندێتی کەسێتی دەردەخات وەك:

| Siyah = kara | ڕەش | Güzel | جوان | Uzun | درێژ |
|---|---|---|---|---|---|
| Bayaz = ak | سپی | Çirkin | ناشرین | Kısa | کورت |
| Kırmızı | سوور | İyi | باش | Sakin | هێمن |
| Yeşil | سەوز | Kötü | خراپ | Deli | شێت |
| Büyük | گەورە | Küçük | بچوك | Çalışkan | زیرەك |

| **Pembe** gömlek | کراسی پەمبە | **Hasta** kadın | ئافرەتی نەخۆش |
|---|---|---|---|
| **Geniş** cadde | شەقامی فراوان | **Acımasız** patron | بەرێوەبەری دلڕەق |
| **Sarı** bayrak | ئالای زەرد | **Güzel** bahçe | باخچەی جوان |
| **Uzun** saç | قژی درێژ | **Gümüş** Madalya | مەدالیای زیو |
| **Yalancı** insan | مرۆڤی درۆزن | **Öfkeli** kız | کچی تووڕە |
| **Zeki** hoca | مامۆستای زیرەك | **Kibirli** zengin | دەوڵەمەندی لووتبەرز |
| **Yakışıklı** genç | گەنجی قۆز | **Soğuk** hava | هەوای سارد |
| **Büyük** yumurta | هێلکەی گەورە | **Uzun** yol | ڕێگای درێژ |

**دووەم/ سیفاتی ڕوون کردنەوە (Belirtme Sıfatları):** ئەم جۆرەیان دەبێتە چـوار لقی سەرەکی کە بریتین لە سیفاتەکانی (**ئاماژە، ژمارە، ناڕوونی، پرس**).

A- **سیفاتی ئاماژە** (İşaret Sıfatları): **بۆ ئاماژەدان و نیشـاندان بـەکار دێـت و وەڵامی پرسیاری کامە؟(Hangi?) دەداتەوە،** لە زمانی تورکیدا ئەو ووشـانە هـەن بـۆ نیشاندان و ئاماژەدان بە کەسێك، شتێك، یان چەمکێك:

| ئاوا (زۆر دوور) | Öyle | ئەمە (نزیك) | Bu |
|---|---|---|---|
| ئەوەی تر | Diğer | ئەوە (دوور) | Şu |
| ئەوەی تر | Öbür | ئەویَ (زۆر دوور) | O |
| ئەوەی تر (ئەوەی دوورتر) | Öteki | ئاوا (نزیك) | Böyle |
| ئەوەی هێروە (ئەوەی نزیکتر) | Beriki | ئاوا (دوور) | Şöyle |

| | |
|---|---|
| Hangi çocuk senin kardeşin?<br>**Bu** çocuk benim kardeöim. | کامە منداڵ برای تۆیە؟<br>ئەو منداڵە برای منە. |
| Şu araba mı senin?<br>Hayır, **diğer** araba benim. | ئەو ئۆتۆمبێلەیە هی تۆ؟<br>نەخێر، ئۆتۆمبێلەکەی تر هی منە. |
| O caddeye mi gidelim?<br>Yok, **öbür** caddeye gidelim. | بچینە ئەو شەقامەوە؟<br>نەخێر، بابچینە شەقامەکەی تر. |
| Bu çocuk Ali, **öteki** çocuk Aso. | ئەو مناڵە عەلیە، مناڵەکەی تر ئاسۆیە. |
| **Beriki** kitap ver. | ئەو کتێبەی هێروەم بدێ. |
| **Öyle** bir durumdayım ki köpek halime gülüyor. | لە دۆخێکی ئاوادام کە سەگ بەحاڵم پێدەکەنێ. |

| **Böyle** gayretli bir kızı severim. | کچێکی ئاوا تێکۆشەرم خۆش دەوێت. |
|---|---|

تێبینی:

١- هەرکات سیفاتەکان لە ڕستەیەکدا بەیەکەوە کۆبوونەوە ئەوا **سەرەتا سیفاتی ئاماژە(İşaret S.) پاشان سیفاتی چۆنیەتی(Niteleme S.) دێت**.

| **Bu güzel** çiçeği sana aldım. | ئەو گوڵە جوانەم بۆتۆ کڕیوە. |
|---|---|
| **Böyle ağırbaşlı** öğrenciyi severim. | قوتابی ئاوا سەنگینم خۆش دەوێت. |

٢- دەشێ سیفاتی ئاماژە (İşaret S.) ببێتە **جێناو**، ئەویش بەلادانی ناوەکەی پاشی کە ئەرکی سیفاتێتی پێ لەدەست دەدات.

| **Bu** güzel çiçeği sana aldım.<br>ئەو گوڵە جوانەم بۆتۆ کڕیوە. | لێرەدا (Bu) سیفاتی ئاماژەیە. |
|---|---|
| **Bunu** sana aldım.<br>ئەوەم بۆتۆ کڕیوە. | لێرەدا (Bu) جێناوی ئاماژەیە. |

B- **سیفاتی ژمارەیی** (Sayı Sıfatları): ئەم جۆرەیان **تایبەتمەندێتی ژمارەیی بوونەوەر و شتەکان ڕوون دەکاتەوە**. ئەم لقەش دەبێتە چوار بەش کەبریتین لە **(ژمارە تەواوەکان، ڕیزبەندی، دابەشکاریی، کەرتەکان)**.

١- **سیفاتی ژمارە تەواوەکان** (Asıl Sayı Sıfatları): بریتین لە ژمارە تەواوەکانی وەك: یەك، دوو، سێ، بیست، پەنجا، حەفتاو دوو، سەد، پێنج سەدو چل و سێ، هەزار...هتد. **وەڵامی پرسیاری چەند**؟(kaç?) و **چەند دانە**؟(Kaç tane?) دەداتەوە.

| Elimde **üç** kalem var.<br>سێ پێنووس لەدەستم دایە. |
|---|
| Sınıfta **yirmi dört** öğrenci var.<br>بیست و چوار قوتابی لە پۆل هەن. |
| Okuldan **beş** yıl önce mezun oldum.<br>پێنج ساڵ لەمەوبەر لە قوتابخانە دەرچووم. |
| Yağış **on iki** saattir devem ediyor.<br>دووانزە کاتژمێرە بارین بەردەوامە. |
| Türkiye'de **üç** yıl kalacağım.<br>سێ ساڵ لە تورکیا دەمێنمەوە. |

تێبینی: **هەرکات ژمارە هەبوو، ناو بەهیچ شێوەیەك پاشگری کۆکردنــەوە (-lar/-ler) وەرناگرێت.**

| Üç çocuk (✓) | Üç çocuk**lar** (☒) |
|---|---|
| Sekiz otobüs (✓) | Sekiz otobüs**ler** (☒) |

بەڵام هەندێ ناوی تایبەت هەن کە **حاڵەتی شازن** و لەو یاسایە بەدەرن وەك:

| **Beşevler** | Ali Baba ve **kırk** harami**ler** |
|---|---|
| **Üç** silahşör**ler** | Pamuk prenses ve **yedi** cüce**ler** |

٢- **سیفاتی ژمــارەیی ڕیزبەنــدی** (Sıra Sayı Sıfatları): **ڕیزبەنــدی بوونــەوەر و شتەکان ڕوون دەکاتەوە لە ڕووی چەندەمینەوە**، ئەمەش لەڕێگای زیادکردنی پاشــگری (-**IncI**) بۆ سەر ناوی ژمارەکان، یــان ووشــەکانی وەك (ilk/son/sonuncu)، وەڵامــی پرسیاری **چەندەمین**؟ (kaçıncı?) دەداتەوە.

| **Sayı + -ıncı/-inci/-uncu/-üncü + isim** |
|---|

| Birinci یەکەم | Ikinci دووەم | Üçüncü سێیەم | Dördüncü چوارەم | Beşinci پێنجەم |
|---|---|---|---|---|
| Altıncı شەشەم | Yedinci حەوتەم | Sekizinci هەشتەم | Dokuzuncu نۆیەم | Onuncu دەیەم |
| Yirminci بیستەم | Otuzuncu سییەم | Kırkıncı چلەم | Ellinci پەنجاهەم | Altmışıncı شەستەم |
| Yetmişinci حەفتاهەمین | Sekseninci هەشتاهەمین | Doksanıncı نەوەدەمین | Yüzüncü سەدەمین | Bininci هەزارەمین |

| | |
|---|---|
| Biz **ikinci** katta kalıyoruz. | ئێمە لە قاتی دووەم دەمێنینەوە. |
| **Birinci** sıradaki çok geveze. | ئەوەی یەکەمین ڕیز زۆر زۆربلێیە. |
| **İlk** dersimiz çok zordu. | یەکەم دەرسمان زۆر قورس بوو. |
| **Son** teneffüsta hatırlatın. | لە کۆتا پشوودا بەبیرم بێننەوە. |
| Okuldaki **sonuncu** senemizde evlendik. | لەکۆتاهەمین ساڵی قوتابخانەماندا هاوسەرگیریمان کرد. |

**٣- سیفاتی ژمارەیی دابەشکاریی** (Üleştirme Sayı Sıfatları): **بەگرووپ کردن و بەش بەش کردنی ژمارەکان بەشێوەی یەکسان ڕوون دەکاتەوە** وەك (یەك یەك، دوو دوو، سەد سەد، هەزار هەزار...هتد)، ئەمەش بە زیادکردنی پاشگری (**-ar/-er/-şar/-şer**) بۆسەر ناوی ژمارەکان دەبێت، وەڵامی پرسیاری **چەند چەند**؟ ( kaçar tane?) دەداتەوە.

**Sayı + -Ar/-şAr + İsim**

**ئەگەر ناوی ژمارەیەك كۆتایی هاتبوو بە پیتێكی نەبزوێن ئەوا پاشگری (-ar/-er)ی بۆ زیاد دەكرێت، ئەگەریش كۆتایی هاتبوو بە پیتێكی دەنگی ئەوا پاشگری (-şar/-şer)ی بۆ زیاد دەكرێت.**

| Bir**er** | یەك یەك |
|---|---|
| İkiş**er** | دوو دوو |
| Üç**er** | سێ سێ |
| Dörd**er** | چوار چوار |
| Beş**er** | پێنج پێنج |
| Altı**şar** | شەش شەش |
| Yedi**şer** | حەوت حەوت |
| Sekiz**er** | هەشت هەشت |
| Dokuz**ar** | نۆ نۆ |
| On**ar** | دە دە |

| Bu ilaçtan günde üç**er** doz alacaksınız.<br>لەو دەرمانانە ڕۆژی سێ سێ دەیخۆیت. |
|---|
| Her birimiz bir**er** hedef belirledik.<br>بۆ هەریەکێکمان یەك ئامانجمان دیاری کرد. |
| Her bölgenin altı**şar** sorumlusu var.<br>هەر ناوچەیەك شەش شەش بەرپرسی هەیە. |
| Her çocuğa iki**şer** hediye verdik.<br>دوو دوو دیاریمان دایە هەر منداڵێك. |
| Her apartmanda sekiz**er** daire var.<br>هەر باڵەخانەیەك هەشت هەشت شوقەی تیایە. |

**٤- سیفاتی ژمارە کەرتیەکان** (Kesir Sayı Sıfatları): **ژمارە کەرتیەکان، لە دەیا، لە سەدا ٪، لە هەزارا ڕوون دەکاتەوە**، وەك (یەك لەسەر دوو، لەسەدا پەنجا، چارەگ، نیو، تەواو...هتد).

| Fabrikamız **tam** gün çalışıyor.<br>کارگەکەمان تەواوی ڕۆژ کار دەکات. |
|---|
| Bu okulda **yarım** dönem okuyacağım.<br>نیو وەرز لەو قوتابخانەیە دەخوێنم. |
| Şirketin **dörtte bir** oranında satılacak.<br>یەك لە چواری ڕێژەی کۆمپانیاکە دەفرۆشرێت. |
| ٢٥ kuruş bir **çayrek** liradır.<br>٢٥ قروش یەك چارەگ لیرەیە. |
| Binaların **yüzde ellisi** hasarlı.<br>سەدا پەنجای بیناکان خەسارەتە. |
| **Üçte bir** nüfus köylerde yaşıyor.<br>یەك لە سێی دانیشتوان لە گوندەکان دەژین. |

تێبینی: چۆنیەتی ڕیزکردنی سیفاتە جۆراوجۆرەکان لەیەك ڕستەدا بەم شێوەیە دەبێت:

| **işaret sıfatı + sayı sıfatı + niteleme sıfatı + İsim** |
|---|
| Bu üç tarihi şehre gezelim.<br>با سەردانی ئەو سێ شارە مێژووییە بکەین. |
| Şu dört bozuk bilgisayarı tamir edin.<br>ئەو چوار کۆمپیوتەرە تێکچووە چاك بکەنەوە. |
| Diğer dört yararlı çocuk çıktılar.<br>چوار منداڵە بریندارەکەی تر دەرچوون. |

C- **سیفاتی ناڕوونی** (Belirsizlik Sıfatları): بوونەوەرێك یان شتێك هەیە بەڵام ڕادەی چەندێتیەکەی بەتەواوی دیار نیە و **سیفاتی ناڕوونی بەلایەنی کەم و زۆریدا نیشانی دەدات.**

| Tüm | هەموو | Çok | زۆر |
|---|---|---|---|
| Bütün | هەموو | Çoğu | زۆربەی |
| Az | کەم | Fazla | زیاتر |
| Azıcık | زۆر کەم | Bunca | تابڵێی زۆر، ئەوەندە |
| Biraz | کەمێك | Her | هەموو، هەر |
| Bir | یێك (کەسێك) | Hiç | هیچ |
| Birkaç | هەندێك، چەند | Hiçbir | هیچێك |
| Bir çok | زۆرێك | Kimi | هەندێ |
| Bir hayli | زۆرێك | Bazı | هەندێ |
| Bir sürü | کۆمەڵێك | Nice: Oldukça | تابڵێی زۆر |
| Bir yığın | تۆپەڵێك | Başka | هیتر |
| Pek az | کەمێك | Sınırsız sayıda | بێ سنوور |
| Pek çok | زۆرێك | Birtakım | تاقمێك، کۆمەڵێك |

| **Biraz** vaktim olsa sana yardım ederim.<br>کەمێك کاتم هەبێت یارمەتیت دەدەم. |
|---|
| Yapmam gereken **bir yığın** işim var.<br>کۆمەڵێك کارم هەیە پێویستە بیانکەم. |
| **Bunca** yeni eşyayı çöpe mi atacaksın? |

| Acık**mış** çocuğu doyurduk.<br>منداڵە برسیەکەمان تێرکرد. |
|---|
| Yoldan çık**mış** insanlardan uzak dur.<br>لە مرۆڤە لەرێ دەرچووەکان دووربە. |
| Susa**mış** çiçeği suladım.<br>گوڵە تینووەکەم ئاودا. |
| Sınava gir**miş** öğrenciler buraya gelin.<br>قوتابیە داخڵ بووەکان وەرنە ئێرە. |
| Don**muş** meyveleri çöpe attık.<br>میوە بەستووەکانمان فڕێدایە زبڵدان. |

- سیفاتە فرمانی (-mIş) دەتوانێ ببێتە ناو لە ڕستەدا، ئەویش بە لادانی ناو(İsim)ەکەی پاشی.

| Çok **bilmiş** <u>insanlarla</u> dolaşma! | لەگەڵ مرۆڤە زۆرزانەکان مەگەڕێ! |
|---|---|
| Çok **bilmişlerle** dolaşma! | لەگەڵ زۆرزانەکان مەگەڕێ! |

- زۆرێك لەو ووشانەی کە پاشگری (-mIş)یان لەسەرە بوونەتە قاڵب و وەك ناوێکی سەربەخۆ بەکاردێن لەکاتی قسەکردن و نوسیندا.

| Ermiş | تواوە | Tanınmış | ناسراو |
|---|---|---|---|
| Yaratılmış | بەدیهێنراو | Görmüş geçirmiş | دونیا دیتە |

## E- پاشگری (-AsI):

سیفاتەفرمانێکە مانای ویست و خواست و شایەن بوون دەگەیەنێت، دەچێتە سەر ڕەگی فرمان(Fiil) و دەیگۆڕێت بۆ سیفات(Sıfat). بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی بە **دوو** شێوە دەردەکەوێت (-ası/-esi).

- ئەرکەکانی:

١- مانای **شایەن بوون و موستەهەق بوون و دوعای خراپ** (Layık, Müstahak, Beddua). **لێرەدا تەنها دەچێتە سەر فرمانی بکەر نادیار (Edilgen Fiil) و جێناوی خاوەندارێتیش(iyelik eki) وەرناگرێت.**

| **Edilgen fiil + (y) -AsI + isim** |
|---|
| Babam öpül**esi** elleri var.<br>باوکم دەستانێکی شیاو بە ماچ کرانی هەیە. |
| Dövül**esi** çocuk.<br>مندالّی شایان بە لێدران. |
| Bu yıkıl**ası** eve girmem.<br>ناچمە ئەو خانووەی شایانی کاول بوونە. |
| Antalya’da gezil**esi** pek çok mekan var.<br>لە ئەنتالّیا شوێنی زۆر هەن کە شایانی ئەوەن گەشتیان بۆ بکرێت. |
| Burası yaşan**ası** bir şehir olmaktan çıktı.<br>ئێرە لەوە دەرچووە کەشارێکی شایان بە ژیان بێت. |
| Geber**esi** adam hayvana zulmetmiş.<br>ئەو پیاوەی شایانی تۆپینە ستەمی لە ئاژەڵەکە کرد. |

٢- مانای **ویستن و حەزپێکردن** (İstek)، دەچێتە سەر ڕەگی فرمان، **جێناوی خاوەنداریێتی (iyelik eki) وەردەگرێت.**

| **Fiil + (y) -AsI + iyelik eki + gel + zaman eki** |
|---|
| Çok komikti, adama gül**esi**m geldi.<br>زۆر کۆمێدی بوو پێکەنینم بە پیاوەکە هات. |
| O kadar sıkıldım ki çığlık at**ası**m geliyor.<br>ئەوەندە دڵ توندم کە ئارەزوو دەکەم هاوارکەم. |
| Bağdat'a gid**esi**m geliyor.<br>ئارەزووی چوونە بەغدام هەیە. |

٣- **ئارەزووکردن** (Dilek)، دەچێتە سەر ڕەگی فرمان. **جێناوی خاوەنداریێتی وەردەگرێت.**

| **Fiil + (y) AsI +iyelik eki + var/yok** | |
|---|---|
| Hiç gid**esi**m yok. | هیچ ئارەزووی چوونم نیە. |
| Kahve iç**esi**n var mı? | ئارەزووی قاوە خواردنەوەت هەیە؟ |
| Uyuy**ası**m yok. | ئارەزووی نووستنم نیە. |

## F- پاشگرەکانی زەمەنی بەرفراوان (-r/-ar/-er/-ır/-ir/-ur/-ür):

ئەم پاشگرانە دەچنە سەر ڕەگی فرمان(Fiil) و دەیگۆڕن بۆ سیفات(Sıfat). بەشێوەیەکی گشتی ئەو سیفاتە فرمانانە بوونەتە قاڵب و ناوی سەربەخۆ و زۆربەی کات وەك ناوی داڕژاوی سەربەخۆ بەکار دەهێنرێن.

| Fiil + -r/-ar/-er/-ır/-ir/-ur/-ür | | | |
|---|---|---|---|
| Yaz**ar** | نووسەر | Ak**ar** su | ڕێڕەوی ئاو |
| Oku**r** yaz**ar** | خوێندەوار | At**ar** damar | دەماری خوێنبەر |
| Oku**r** | خوێنەر | Bak**ar** kör | کت و کوێر |
| Çal**ar** saat | سەعاتی ووریاکەرەوە | Çık**ar** yol | ڕێگا چارە |
| Gel**ir** | داهات | Tut**ar** | کۆ، بڕ |
| Gid**er** | خەرجی | Kurtar**ır** | ڕزگارکەر |

| Bu ak**ar**su tüm ovayı sulamakta.<br>ئەو جۆگەیە تەواوی دەشتەکە ئاو دەدات. |
|---|
| Bu davranışların sana bir yar**ar**ı yok<br>ئەو هەڵسوکەوتەت هیچ سودێکی بۆتۆ نیە. |
| .Ali gül**er** yüzlü bir erkektir<br>عەلی کوڕێکی ڕوو بە خەندەیە. |

## G- پاشگرەکانی زەمەنی بەرفراوان (-mAz)

بریتیە لە پاشگری نەرێی زەمەنی بەرفراوان، دەچێتە سەر ڕەگی فرمان(Fiil) و دەیگۆڕێ بۆ سیفات(Sıfat)، بەشێوەیەکی گشتی ئەو سیفاتە فرمانانە بوونەتە ناوی سەربەخۆو **بەمانای بێ سنوورێتی یان نەفی کردنی ڕەها دێت**. زۆربەی کاتیش **دەچنە سەر فرمانی بکەر نادیار**. بەگوێرەی هەماهەنگی دەنگی بە **دوو** شێوە دەردەکەوێ (**-maz/-mez**).

| **Fiil + -maz/-mez** | | |
|---|---|---|
| Taşın**maz** mal<br>ماڵی نەگوازراوە | Çözül**mez** sorun<br>کێشەی بێ چارە | Sön**mez** ışık<br>تیشکی نەکوژاوە |
| Görün**mez** kaza<br>ڕووداوی نەبینراو | İnanıl**maz**<br>باوەڕ پێ نەکراو | Çık**maz** sokak<br>کۆڵانی داخراو |
| Kırıl**maz** cam<br>جامی نەشکاو | Dayanıl**maz** acı<br>خەمی بەرگەنەگیراو | Bit**mez** yol<br>ڕێگای نەبڕاوە |
| Unutul**maz** anı<br>یادەوەری لەبیرنەکراو | Akıl al**maz** iş<br>کاری لەئەقڵ بەدەر | Yan**maz** kumaş<br>قوماشی نەسوتاو |

تێبینی: **پێویستە ئاگاداربین پاشگرەکانی سیفاتە فرمان و پاشگری زەمەنەکان تێکەڵ نەکەین، هەرچەندە پاشگرەکان وەك یەك بن بەڵام لەڕووی واتاوە زۆر جیاوازن**، وەك لەم دوو لیستەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

| پاشگرەکان وەك سیفاتە فرمان | پاشگرەکان وەك زەمەن |
|---|---|
| Yaz**acağ**ım kitap tarihle ilgili.<br>ئەو کتێبەی دەینووسم پەیوەستە بەمێژوو. | Bu kitabı yaz**acağ**ım.<br>ئەو کتێبە دەنووسم. |
| Ağla**mış** çocuğa para verdim.<br>پارەم دایە منداڵە گریاوەکە. | Çocukken çok ağla**mış**ım.<br>کاتێ منداڵ بووم زۆر گریاوم. |
| Bu ay gid**er**im çok fazla.<br>ئەو مانگە خەرجیم گەلێك زۆرە. | Her sabah lokantaya gid**er**im.<br>هەموو بەیانیەك دەچمە خواردنگە. |
| İnanıl**maz** bir olayı duydum.<br>ڕووداوێکی باوەڕپێنەکراوم بیست. | Ali sana inan**maz**.<br>عەلی باوەڕ بە تۆ ناکات. |

## • لقی دووەم/ زەرفە فرمان (Zarf-Fiil)

پێشی دەڵێن (**Ulaç**)، زەرفە فرمان نۆ دانە پاشگری هەیە. ئەم پاشگرانە دەچنە سەر فرمانەکان(Fiil) و دەیانگۆڕن بۆ زەرف(ئاوەڵفرمان)(Zarf). هەموو کاتیش یان دەبنە زەرفی بارودۆخ(Durum Z.) یان زەرفی کات(Zaman Z.). وەك یاسایەکی نەگۆڕیش پێویستە فرمانێك لەدوایانەوە هەبێت (Zarf+Fiil) بۆ ئەوەی ببنە ئاوەڵفرمان. ئەم زەرفە فرمانیانە وەڵامی پرسیارەکانی چۆن؟(Nasıl?) و چ کاتێك؟(Ne zaman?) و بۆچی؟(Niçin?) دەدەنەوە. **بەهیچ جۆرێکیش جێناوی خاوەندارێتی و جێناوی کەسی و پاشگرەکانی حاڵی وەرناگرن.**

| -İp | - mAdAn | - ArAk | -A...A | - IncA |
|---|---|---|---|---|
| - Ar...mAz | -AlI | - DIkçA | - ken | |

## A- پاشگری (-Ip)

**بۆ بەستنەوەی دوو ڕستەیە بەیەکترەوە**، دەچێتە سەر ڕەگی فرمان و دەیگۆڕێت بۆ زەرفی بارودۆخ (Durum Z.). ئەم پاشگرە لەجیاتی (ve / , ) لەنێوان دوو فرمان یان زیاتر دادەنرێت (بەهۆی گرنگی و زۆری بەکارهێنانی ئەم پاشگرە لە ئاستی دووەم A٢یشدا باس کراوە). بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی بە **چوار** شێوە دەردەکەوێ.

| **Fiil + (y) -ıp/-ip/-up/-üp + ana cümle** |
|---|
| Tüm soruları doğru yanıtlayı**p** yüz aldım. |

| هەموو پرسیارەکانم ڕاست وەڵام دایەوەو سەدم هێنا. |
|---|
| Kitabı aç**ıp** bir göz gezdirdim.<br>کتێبەکەم کردەوەو چاوێکم پێدا خشاند. |
| Dersten çık**ıp** yürüy**üp** kaçtım.<br>لە دەرس هاتمەدەر و ڕۆشتم و ڕام کرد. |

<u>تێبینی:</u>

**١- ئەو فرمانەی کە پاشگری (Ip-) وەردەگرێ مانای هەمان کات و زەمەنی ئەو فرمانە وەردەگرێ کە لەپاشی دێت**، چونکە خۆی هیچ پاشگرێکی زەمەنی لەسەر نیە و مانای هیچ زەمەنێك نادات بەبێ فرمانەکەی پاشی، هەروەها هەمان بکەریشی دەبێت.

٢- بەهۆی (**-ma/-me**) دەبێتە نەرێ(olumsuz)، ئەو شێوازەش کاتێك بەکاردێت کە کارێك هەیە پێویستە بیکات، کەچی ئەو کارە ناکات و ڕێك پێچەوانەکەی دەکات.

| Eti çok sever ama et ye**meyip** sebze tercih etti.<br>زۆری حەز لە گۆشتە، بەڵام گۆشتی نەخوارد و سەوزەی هەڵبژارد. |
|---|
| Ders çalış**mayıp** sinemaya gitti.<br>دەرسی نەخوێند و چووە سینەما. |
| Bana yardım et**meyip** Ali'ye yardım etmiş.<br>یارمەتی منی نەدا یارمەتی عەلی دا. |

٣- فرمانی (**ye-**) دەبێتە (**yi-**) ئینجا ئەم پاشگرە وەردەگرێ و دەبێتە (**yiyip**).

## B- پاشگری (-mAdAn)

ئەم پاشگرە لە زمانی تورکیدا زۆر بەکاردەهێنرێ و لەڕستەدا بە دوو مانای جیاواز دێت، ئەگەر بە**مانای (بەبێ)** هات دەبێتە زەرفی بارودۆخ (Durum Z.)، بەڵام ئەگەر **بەمانای (پێش)** هات دەبێتە زەرفی کات(Zaman Z.). ئەگەر بەمانای (پێش) بەکاربێت زۆربەی جار ووشەی (**önce**)ی لەگەڵ بەکاردێت و دەبێتە (**-mAdAn önce**). بەپێی یاسای دەنگی بە (**-madan/-meden**) دەردەکەوێت. (بەهۆی گرنگی و بەکارهێنانی زۆری لەئاستی دووەم A٢یشدا باسکراوە)

| |
|---|
| Karar ver**meden önce** çok düşün.<br>پێش بڕیاردان زۆر بیر بکەوە. |
| Karar ver**meden** hiçbir şey yapılmaz.<br>بەبێ بڕیاردان هیچ شتێك ناكرێت. |
| Derse git**meden** kahvaltı yaparım.<br>پێش چوونە دەرس نانی بەیانی دەخۆم. |
| Kalın elbise giy**meden** evden çıkmam.<br>بەبێ پۆشینی جلی ئەستور لەماڵ دەرناچم. |

## C- پاشگری (-ArAk)

دەچێتە سەر فرمان و دەیگۆڕێت بۆ زەرفی بارودۆخ(Durum Z.). بەپێی یاسای دەنگیش بەشێوەی (**-arak/-erek**) دەردەکەوێ، نزیکەی بەمانای ( ئاوا، بە) دێت، بەپاشگری (**-ma/-me**) دەکرێتە نەرێ.

| Fiil + (y) -ArAk + ana cümle | | | |
|---|---|---|---|
| Gül**erek**<br>بەپێکەنینەوە | Patla**yarak**<br>بەتەقینەوە | Kız**arak**<br>بەتوڕەبوونەوە | Ağla**yarak**<br>بەگریان |
| Kaç**arak**<br>بەڕاکردن | Uyu**yarak**<br>بەخەوتنەوە | Başla**yarak**<br>بەدەست پێکردنەوە | Bak**arak**<br>بەسەیرکردنەوە |
| Gid**erek**<br>بەڕۆیشتنەوە | Bil**erek**<br>بەئەنقەست | Bil**meyerek**<br>بەنەزانی | At**arak**<br>بەهاوێشتنەوە |

- دەتوانرێت بەهۆیەوە دوو ڕستە لێك بدرێت.

| | |
|---|---|
| - Çocuklar koşuyor.<br>- Bize doğru geliyor.<br>Çocuklar koş**arak** bize doğru geliyor. | - منداڵەکان ڕا دەکەن.<br>- بۆ لای ئێمە دێن.<br>منداڵەکان بە ڕاکردن بۆ لای ئێمە دێن. |

| |
|---|
| Ali gülümse**yerek** bana baktı.<br>عەلی بەخەندەوە سەیری منی کرد. |
| Kimisi dans ed**erek**, kimisi sohbet ed**erek** eğleniyor.<br>هەندێکیان بە دانس کردنەوە، هەندێکیشیان بە قسەکردن ڕادەبوێرن. |
| Bir hanım ağla**yarak** hastalığını anlatıyor.<br>خانمێك بەگریانەوە نەخۆشیەکەی باس دەکات. |
| Aso uyu**yarak** yürüyor.<br>ئاسۆ بەخەوالّویی دەڕوات. |
| Ameliyat olm**ayarak** hayatını riske atıyorsun.<br>بەعەمەلیات نەکردن ژیانت دەخەیتە مەترسیەوە. |
| Gid**erek** Türkçem daha iyi olur.<br>بەتێپەڕینی کات تورکیەکەم باشتر دەبێت. |

## - ووشەی (**olarak**)

بەهۆی پاشگری (**-arak/-erek**) دروست بــووە (**ol + arak**) لــەزمانی تورکیـدا زۆر بەکاردەهێنرێت، واتە (بەسیفەتی ئەوە) (وەك ئەوە).

| | |
|---|---|
| Mühendis **olarak** çalışıyorum. | وەك ئەندازیار کار دەکەم. |
| Başkan **olarak** sesleniyor. | وەك سەرۆك قسە دەکات. |
| Öğretmen **olarak** atandım. | وەك مامۆستا دامەزرام. |
| Ben bir Kürt **olarak** ırkçılığa karşıyım. | من وەك کوردێك دژی ڕەگەزپەرستیم. |

## D- پاشگری (-A...A)

هــەمان مانــای (-ArAk)ی هەیــە، دەچــێتە ســەر فرمــان و دەیگۆڕێــت بــۆ زەرفــی بارودۆخ(Durum Z.)، بەپێی یاسای دەنگیش بەشێوەی (**-a...a/-e...e**) دەردەکەوێ.

| | |
|---|---|
| Gül**e** gül**e** dersi dinledi. | بەپێکەنینەوە گوێی لەدەرس گرت. |
| Çocuk koş**a** koş**a** eve gitti. | منداڵەکە بەڕاکردنەوە چووەوە ماڵ. |
| Bak**a** bak**a** yalan söylüyor. | بەزەقە زەقی چاو درۆ دەکات. |
| Bil**e** bil**e** babasını kızdırıyor. | بە ئەنقەست باوکی توڕە دەکات. |
| Otobüs bekle**ye** bekle**ye** ağaç olduk. | بەچــاوەڕوانی کردنــی پــاس ڕەق بووینەوە. |

- هەندێ ووشە بەهۆی ئەم پاشگرەوە بوونەتە قاڵب و وەك دەستەواژە بەکار دەهێنرێن.

| Güle oyna**ya**<br>بەخۆشی و کەیفەوە | Bil**e** bil**e**<br>بەئەنقەست | Ufla**ya** pufla**ya**<br>بەئاخ و ئۆفەوە |
|---|---|---|
| Ezil**e** büzül**e**<br>بەشەرم و حەیاوە | İt**e** kak**a**<br>بەپاڵپاڵێن بەزەحمەت | Hopla**ya** zıpla**ya**<br>بەهەڵبەزو دابەزەوە |
| Düş**e** kalk**a**<br>بەزەحمەت، بەحاڵ | Gül**e** gül**e**<br>بەپێکەنینەوە | Utan**a** sıkıl**a**<br>بەشەرم وحەیاوە |

- ووشەی (**Diye**)

یەکێکە لەو ووشە گرنگانەی لە زمانی تورکیدا زۆر بەکاردەهێنرێت. بەهۆی ئەم پاشگرەوە دروست بووەو **سێ مانا و ئەرکی جیاوازی هەیە:**

١- لە **ڕستەی ئامانجیدا**(Amaç Cü.): لێرەدا (Diye) ڕۆڵی (-mAk için) دەبینێت و **بەمانای (بۆ ئەوەی) دێت**.

| Temiz hava alabilelim **diye** pencereleri açtık.<br>بۆئەوەی بتوانین هەوای پاك هەڵبمژین پەنجەرەکانمان کردەوە. |
|---|
| Köylüler yağmur yağsın **diye** yağmur duasına çıktılar.<br>بۆ ئەوەی باران ببارێت گوندنشینان بۆ دوعابارانە دەرچوون. |
| Türkiye’de okuyayım **diye** ailem bana yardım etti.<br>بۆ ئەوەی لە تورکیا بخوێنم خێزانەکەم یارمەتیان دام. |

٢- لـه ڕسـتەی **هۆکاریـدا** (Sebep Cü.): لێـرەدا (Diye) ڕۆڵـی ( -DIk+iyekik eki+için) دەبینێت و **بەمانای (لەبەر ئەوەی، بەهۆی) دێت.**

| Çok çalışmadı **diye** pişman oldu.<br>لەبەرئەوەی زۆری نەخوێند پەشیمان بووەوە. |
|---|
| Telefonu kayboldu **diye** oturup ağladı.<br>لەبەرئەوەی تەلەفۆنەکەی وون کرد دانیشت و گریا. |
| Çok iyi Türkçe bilmem **diye** hata yapıyorum.<br>لەبەرئەوەی زۆرباش تورکی نازانم هەڵە دەکەم. |

٣- لەکاتی گواستنەوەی دەقاودەقی قسەی کەسێك (Diye) بـەکاردەهێنرێت و **بـەمانای (بەم شێوەیە، ئاوا، وا)** دێت.

| ERDOĞAN "Durmak yok yola devem!" **diye** söyledi.<br>ئەردۆغان: (وەستان نیە، بەردەوام بە لە ڕێ کردن) وای گووت. |
|---|
| Hocamız "Ders bitti" **diye** konuştu.<br>مامۆستامان وای گووت (وانە تەواو بوو). |
| "Lütfen emniyet kemerlerinizi bağlayın" **diye** anons yaptı.<br>ئاوا ئاگاداری دا (تکایە پشتێنەی سەلامەتی ببەستن). |
| Babam her zaman "Kendini uyar!" **diye** söyler.<br>باوکم هەموو کات وا دەڵێت (ئاگاداری خۆت بە!). |
| Irak çok sıcak bir ülkedir **diye** biliyorum.<br>وا دەزانم (پێم وایە) عێراق وولاتێکی زۆر گەرمە. |

## E- پاشگری (-IncA)

ئەم پاشگرە **بەمانای (لەدوای) دێت** و هەمان واتای (-DIktAn sonra/sonrasında) دەدات و دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. دەچێتە سەر فرمان و دەیگۆڕێت بۆ زەرفی کات (Zaman Z.). ئەم پاشگرە بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی بە **چوار** شێوە دەردەکەوێت (**-ınca/-ince/-unca/-ünce**).

| **Fiil + -IncA** |
|---|
| Okulumu bitir**ince** ülkeme döneceğim.<br>دوای تەواوکردنی قوتابخانەکەم دەچمەوە وولاتەکەم. |
| Sen gül**ünce** çok şeker oluyorsun.<br>تۆ دوای ئەوەی پێدەکەنیت زۆر شیرین دەبیت. |
| Ders başlay**ınca** herkes susar.<br>دوای دەست پێکردنی وانە هەمووان بێدەنگ دەبن. |
| Yemek yiy**ince** uykum geliyor.<br>دوای نان خواردن خەوم دێت. |
| Seni gör**ünce** mutlu olurum.<br>دوای بینینی تۆ دڵخۆش دەبم. |
| Eve dön**ünce** seni bekliyorum.<br>دوای گەڕانەوە بۆ ماڵ چاوەڕێت دەکەم. |

- بەهۆی (**-ma/-me**) دەکرێتە نەرێ، لەو حاڵەتەشدا مانای مەرجی(Şart) دەدات.

| Gözlük kullan**mayınca** gözlerim ağrıyor.<br>دوای بەکارنەهێنانی چاویلکە چاوانم دێشن. |
|---|
| Gözlük takmaz**sa**m gözlerim ağrıyor. |

| چاویلکە بەکارنەهێنم چاوانم دێشن. |
|---|
| Yeterince uyu**mayınca** huzursuz olurum.<br>دوای نەخەوتن بەپێی پێویست نا ئاسوودە دەبم. |
| Yeterince uyumaz**sa**m huzursuz olurum.<br>بەئەندازەی پێویست نەخەوم نا ئاسوودە دەبم. |

- (**-IncAyA kadar**) یش هەمان مانای (**-AnA kadar**)ی هەیە کە لەوەو پێش خوێنراوە.

| Okula gel**ene kadar** ıslandım. | تا هاتنە قوتابخانە تەڕ بووم. |
|---|---|
| Okula gel**inceye kadar** ıslandım. | تا هاتنە قوتابخانە تەڕ بووم. |
| Gece uyuy**ana kadar** okuyorum. | شەو تا خەوتن دەخوێنمەوە. |
| Gece uyuy**uncaya kadar** okuyorum. | شەو تا خەوتن دەخوێنمەوە. |

- دەتوانین بە چەندین شێوە گرامەری جیاواز هەمان مانا دەربڕین:

| Bebek uyan**ınca** süt içti.<br>منداڵەکە دوای بێداربوونەوە شیری خواردەوە. |
|---|
| Bebek uyan**dıktan sonra** süt içti.<br>منداڵەکە دوای بێداربوونەوە شیری خواردەوە. |
| Bebek uyan**dığı zaman** süt içti.<br>منداڵەکە کاتێ بێداربووەوە شیری خواردەوە. |
| Bebek uyan**dığında** süt içti.<br>منداڵەکە کاتێ بێداربووەوە شیری خواردەوە. |

## F- پاشگری (-Ar...mAz)

ئەم دوو پاشگرە بریتین لە پاشگرەکانی زەمەنی بەرفراوان(Geniş Z.) و بەجیا دەچنە سەر یەك فرمان، فرمانەکە دەگۆڕن بۆ زەرفی کات(Zaman Z.)، جێناوەکانیش وەرناگرن. لەڕووی ماناوە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە لەنێوان ڕووداوی یەکەم و دووەمدا جیاوازیەکی زۆر کەمی کات هەیە. لە زمانی کوردیشدا بەهەمان شێوە بەکاری دێنین.

| **Fiil + -r/-ar/-er/-ır/-ir/-ur/-ür + Fiil + -maz/-mez** |
|---|
| Namaz okun**ur** okun**maz** yemeğe başladı.<br>بانگیدا و نەدا دەستی بە نانخواردن کرد. |
| Eve gir**er** gir**mez** yemek hazır mı? der.<br>دەچێتەژوور و ناچێتەژوور دەڵێ نان ئامادەیە؟ |
| Pencereyi aç**ar** aç**maz** hava girdi.<br>پەنجەرەکەی کردەوەو نەیکردەوە هەوا هاتە ژوور. |
| Güneş doğ**ar** doğ**maz** yola çıktılar.<br>ڕۆژ هەڵات و هەڵنەهات بەڕێ کەوتن. |
| Kardeşini gör**ür** gör**mez** sarılıp öptü.<br>براکەی بینی و نەیبینی لەباوەشی گرت و ماچی کرد. |
| İşlerimi biti**rir** bitir**mez** yanına geliyorum.<br>کارەکانم تەواو بێت تەواو نەبێت یەکسەر دێمە لای. |
| Hoca kağıtları ver**ir** ver**mez** sınav başladı.<br>مامۆستا کاغەزەکانی دابەش کرد و نەکرد تاقیکردنەوە دەستی پێ کرد. |

## G- پاشگری (-AlI)

پاشگری خاڵی دەستپێك (**-alı/-eli**) **بەمانای (لەوەتەی) دێت**. هەمان مانای ( -DAn beri) هەیە. دەچێتە سەر فرمان و دەیگۆڕێت بۆ زەرفی کات (Zaman Z.)، زۆر جاران ئەو پاشگرە لەگەڵ (-DI) بەکاردێت و هەمان واتاش دەدات.

| **Fiil + (y) -alı/-eli** |
|---|
| **Fiil + -DI + Fiil + (y) -alı/-eli** |
| **Fiil + -DIk + iyelik eki + beri** |

| Türkiye’ye gel**eli** çok mutluyum.<br>لەوەتەی هاتوومەتە تورکیا زۆر دڵخۆشم. |
|---|
| Türkiye’ye gel**di** gel**eli** çok mutluyum.<br>لەوەتەی هاتوومەتە تورکیا زۆر دڵخۆشم. |
| Türkiye’ye gel**diğmden beri** çok mutluyum.<br>لەوەتەی هاتوومەتە تورکیا زۆر دڵخۆشم. |
| Kış gel**eli** hiç hasta olmadım.<br>لەوەتەی زستان هاتووە هیچ نەخۆش نەکەوتووم. |
| Kış gel**di** gel**eli** hiç hasta olmadım.<br>لەوەتەی زستان هاتووە هیچ نەخۆش نەکەوتووم. |
| Kış gel**diğinden beri** hiç hasta olmadım.<br>لەوەتەی زستان هاتووە هیچ نەخۆش نەکەوتووم. |
| Bu kitabı okuy**alı** çok değişmiş.<br>لەوەتەی خوێندنەوەی ئەو کتێبە زۆر گۆڕاوە. |
| Bu kitabı oku**du** okuy**alı** çok değişmiş.<br>لەوەتەی خوێندنەوەی ئەو کتێبە زۆر گۆڕاوە. |
| Bu kitabı oku**duğundan beri** çok değişmiş.<br>لەوەتەی خوێندنەوەی ئەو کتێبە زۆر گۆڕاوە. |

- ئەو سێ شێوەی سەرەوەی تەنها لەڕووی ڕێزمانیەوە جیاوازن، ئـەگینا لـەڕووی مانـاوە هەمان مانایان هەیەو شێوەی (dı+AlI) لەهەمووان زیاتر بەکاردەهێنرێت.

## H- پاشگری (-DIkçA)

پاشگری **قۆناغبەندی و نوێ بوونەوەیە**. بەپێی هەماهـەنگی دەنگـی بـە **هەشـت** شـێوە دەردەکـــــــەوێت (-dıkça/-dikçe/-dukça/-dükçe/-tıkça/-tikçe/-tukça/-tükçe). دەچێتە سـەر فرمـان و دەیگۆڕێـت بـۆ زەرف، لەڕسـتەدا دوو ئـەرك و مانـای جیاوازی هەیە:

| Fiil + -dıkça/-dikçe/-dukça/-dükçe/-tıkça/-tikçe/-tukça/-tükçe |
|---|

١- **پلەبەندی و تێپەڕینی کات** (Aşama, Seviye, Derece): لێرەدا دەبێتە زەرفـی ئەندازە (Miktar Z.).

| |
|---|
| Zaman git**tikçe** Ömer daha iyi konuşuyor.<br>بەتێپەڕبوونی کات عومەر باشتر قسە دەکات. |
| Hava soğu**dukça** sokaklar tenhalaştı.<br>بەساردبوونی هەوا کۆڵانەکانیش چۆڵ بوون. |
| Vakit ilerle**dikçe** caddeler kalabalıklaşır.<br>بەچوونە پێشی کات شەقامەکان قەرەباڵغ دەبن. |
| Yağmur yağ**dıkça** ova yeşiliyor.<br>بەبارینی باران دەشت سەوز دەبێت. |

**٢- نوێ بوونەوەو دووبارە بوونەوە** (Yenileme, Aralıklı tekrar)

| İstanbul’a git**tikçe** teyzemi ziyaret ederim.<br>بەچوونەوە ئیستەنبوڵ سەردانی پوورم دەکەم. |
|---|
| Ali’yi gör**dükçe** çocukluk yıllarını hatırlıyor.<br>بەبینینەوەی عەلی سالانی منداڵی بیردێتەوە. |
| Kayseri’ye dön**dükçe** sucuk yerim.<br>بەگەڕانەوە بۆ قەیسەری باسترمە دەخۆم. |

- بەهـۆی پاشـگرەکانی ( **-ma / -me** ) دەبێتە نەرێ (olumsuz) و هەمـــان مانای (**-DIk+iyelik eki+sürece**) دەدات.

| Senden özür dile**medikçe** (dilemediği sürece) onunla konuşma.<br>تا داوای لێبوردنت لێ نەکات قسەی لەگەڵ مەکە. |
|---|
| Diyet yap**madıkça** (yapmadığın sürece) problem yaşarsın.<br>تا ڕیجیم نەکەیت لەکێشەدا دەبیت. |
| Lütfen! gerekli olmadıkça dışarı çıkmayalım.<br>تکایە تا پێویست نەبێت با نەچینە دەرەوە. |

## İ- پاشگری (ken-)

گرنگترین و بەکارهێنراوترین پاشگری زەرفە فرمانە و بەوەش جیادەکرێتەوە کە **هەم لەگەڵ فرمان(Fiil) و هەم لەگەڵ ناویش(İsim) بەکاردێت. ئەم پاشگرە ناکەوێتە ژێر کاریگەری هەماهەنگی دەنگی و وەك خۆی بەجێگیری دەمێنێتەوە**، لەرووی واتاشەوە **بەمانای (لەکاتی، کاتێ) دێت.**

یەکەم/ **لەگەڵ ناو** (İsim): لەگەڵ ناودا دەبێتە زەرفی کات(Zaman Z.). دەتوانرێ بەشێوەی **لکاو** بەناوەکە بنووسرێت بە (**ken-**)، هەروەها دەتوانرێت بەشێوەی **جیا** لە ناوەکە بنووسرێت بە (**iken**) و هیچ جیاوازیشیان نیە.

| **İsim + (y) -ken / iken** |
|---|
| Ben çocuk**ken** çok yaramazdım.<br>من کاتێ منداڵ بووم زۆر هاروهاج بووم. |
| Sen hastay**ken** çok sinirli oluyorsun.<br>تۆ لەکاتی نەخۆشی زۆر توڕە دەبیت. |
| Dostlarım mutluy**ken** ben de mutlu olurum.<br>کاتێ دۆستەکانم دڵخۆشن منیش دڵخۆش دەبم. |
| Annem işte **iken** tüm evi temizledim.<br>کاتێ دایکم لەکار بوو هەمووماڵەکەم پاك کردەوە. |
| Hava soğuk **iken** insan daha hasta olur.<br>کاتێ هەوا سارد دەبێت مرۆڤ نەخۆشتر دەبێت. |
| Öğrenci **iken** çok fakirdim.<br>کاتێ قوتابی بووم زۆر هەژار بووم. |

دووەم/ لەگەڵ **فرمان** (Fiil): پاشگری (-ken) دەچێتەسەر فرمان و دەیگۆڕێت بۆ زەرفی کات(Zaman Z.)، **تەنها بەشێوەی (-ken) و بەلکاوی دەنووسرێت**. لەگەڵ چوار زەمەنی زمانی تورکی و یەك شێوازدا بەکار دەهێنرێت.

| Fiil + zaman/kip ekleri + -ken | | |
|---|---|---|
| Şimdiki Z. | Gel-iyor-ken | کاتێ دێت |
| Geniş Z. | Gel-ir-ken | کاتێ دێت |
| Gelecek Z. | Gel-ecek-ken | کاتێ دێت (لەداهاتوو) |
| Duyulan Geçmiş Z. | Gel-miş-ken | کاتێ هات |
| Gereklilik Kipi | Gel-meli-yken | کاتێ دەبێ بێت |

١- لەگەڵ **کاتی ئێستا** (Şimdiki Z.): دەبێتە (**-yorken**) مانای کاتی ئێستا و کاتی بەرفراوانیش دەدات، بەڵام ئەم شێوازە زۆر کەم بەکاردەهێنرێت.

| Fiil + I + -yor + -ken |
|---|
| Çocuk koşu**yorken** takılıp düştü.<br>منداڵەکە لەکاتی ڕاکردن تەقلەی لێداو بەربووەوە. |
| Yemek yi**yorken** sıkıcı sesler çıkarıyorsun.<br>لەکاتی نانخواردن دەنگی بێزارکەر دەردەبڕی. |
| Yağmur yağı**yorken** ıslandım.<br>لەکاتی باران بارین تەڕبووم. |
| Oyun oynu**yorken** kavga ettiler.<br>لەکاتی یاری کردن شەڕیان کرد. |

٢- لەگـــەڵ **کـــاتی بـــەرفراوان** (Geniş Z.): دەبێتـــە (-rken/-Arken/-Irken/-mAzken)، **ئـــەم شـــێوازە لەهـــەموو شـــێوازەکانی تـــر زیـــاتر بـــەکار دەهێنرێـــت و گرنگترینیانە.**

| **Fiil + -r/-ar/-er/-ır/-ir/-ur/-ür/-maz/-mez + -ken** |
|---|
| Sabahları spor yap**arken** müzik de dinlerim.<br>بەیانیان لەکاتی وەرزش گوێ لە مۆسیقاش دەگرم. |
| Siz konuş**urken** herkes dikkatle dinler.<br>کاتێ ئێوە قسە دەکەن هەموان بە دیقەتەوە گوێ دەگرن. |
| Irmakta yüz**erken** çok zorlanırım.<br>لەکاتی مەلەوانی کردن لە ڕووباردا زۆر نارەحەت دەبم. |
| Yağmur yağ**arken** romantik hissederim.<br>لەکاتی باران بارین هەست بە ڕۆمانسیەت دەکەم. |
| Sen bilgisayar nedir bil**mezken** ben web sitesi yapıyordum.<br>کاتێ تۆ نەتدەزانی کۆمپیوتەر چیە من وێبسایتم دروست دەکرد. |
| Eve gl**irken** alışveriş yapıyorum.<br>کاتێ دێمەوە ماڵ بازاڕ دەکەم. |

٣- لەگەڵ **کاتی داهاتوو** (Gelecek Z.): دەبێتە (**-AcAkken**)، ئەم شێوازە لـە دوو حاڵەتدا بەکار دەهێنرێت:

| **Fiil + (y) -acak/-ecek + -ken** |
|---|

یەکەم/ کارێك هەیە کە نیەتمان هەیە و دەمانەوێت بیکەین بەڵام ڕێك لەو کاتەدا ڕێگـر و لەمپەرێك دێتە پێشەوەو ناتوانین بیکەین.

| Tam uyuy**acakken** o kedi yüzünden uykum kaçtı.<br>ڕێك لەكاتی نووستن بەهۆی ئەو پشیلەوە خەوم زڕا. |
|---|
| Biz tam evlen**ecekken** dedem öldü.<br>ڕێك لەكاتی هاوسەرگیریمان باپیرەم وەفاتی كرد. |
| Tam dönerimi ısır**acakken**, kardeşim dönerimi kapıp yedi.<br>ڕێك لەكاتی گازگرتن لە دۆنەرەكەم براكەم دۆنەرەكەمی ڕفاند و خواردی. |
| Tam seni aray**acakken** seni gördüm.<br>ڕێك لەكاتی پەیوەندەی كردن بەتۆ تۆم بینی. |

دووەم/ كارێك هەیە كە پێویستە بكرێت، بەڵام ئەو كارە ناكرێت و ڕێك پێچەوانەكەی دەكرێت.

| Sınavı vardı, ders çalış**acakken** sinemaya gitti.<br>تاقیكردنەوەی هەبوو، لەكاتی دەرس خوێندن چووە سینەما. |
|---|
| Arkadaşından özür diley**ecekken** bir daha ona vurdu.<br>لەكاتی داوای لێبوردن كردن لە هاوڕێكەی جارێكی تریش لێیدا. |
| Diyet yaptım, zayıflay**acakken** daha da tonton oldum.<br>ڕیجیمم كرد، لەجیاتی لاواز بوون خەپۆكە تریش بووم. |

٤- لەگەڵ كاتی **ڕابردووی بیستراو** (Duyulan Geçmiş Z.): دەبێتە (**-mIşken**)، ئەم شێوازەش دوو ئەركی هەیە و لە دوو حاڵەتدا بەكار دەهێنرێت:

| **Fiil + -mIş + -ken** |
|---|

یەكەم/ كارێك دەكەی و لەپاڵیدا كارێكی زیادەش دەكەی، بەڵام ئەو كارەی دووەم بۆ تۆ قورس و زەحمەت نیە.

| Pazara git**mişken** bana da bir karpuz al!<br>لەکاتی چوونە بازاڕ شووتیەکیش بۆ من بکڕە. |
| --- |
| İş için İstanbul’a git**mişken** tüm müzeleri gezdim.<br>لەکاتی چوونە ئیستەنبوڵ بۆ کار هەموو مۆزەخانەکانیش گەڕام. |
| Odamı temizle**mişken** kaybolmuş yüzüğümü de arayın!<br>لەکاتی پاککردنەوەی ژوورەکەم بەدوای ئەنگوستیلە وونبووەکەشم دا بگەڕێن. |
| Dışarı çık**mışken** bir lokantaya gidelim.<br>لەکاتی چوونە درەوە با بچینە خواردنگەیەك. |

دووەم/ ڕێك لەو کاتەی کارێك دەکەی کارێك یان شتێکی تریش ڕوو دەدات.

| Akşam eve gir**mişken** elektrik kesildi.<br>ئێوارە لەکاتی چوونەماڵەوە کارەبا بڕا. |
| --- |
| Sınava gir**mişken** Ayşe bayıldı.<br>لەکاتی چوونە تاقیکردنەوە ئایشە بوورایەوە. |
| Tam kuaförden çık**mışken** rüzgar esti.<br>ڕێك لەکاتی هاتنەدەر لە سالۆن ڕەشەبا هەڵی کرد. |
| Tam arabamı yıkat**mışken** sağanak yağmur başladı.<br>ڕێك لەکاتی غەسڵ کردنی ئۆتۆمبێلەکەم باوبۆران دەستی پێکرد. |

لەو ئەرکەدا ووشەکانی (**tam/hazır**) واتە (ڕێك لەو کاتەدا) زۆر بەکاردێن.

٥- لەگەڵ **شێوازی پێویست** (Gereklilik Kipi): دەبێتە (**-mAlIyken**)، ئەم شێوازەش دوو ئەرکی هەیە و لە دوو حاڵەتدا بەکار دەهێنرێت:

| **Fiil + -malı/-meli + -yken** |
| --- |

یەکەم/ کارێك هەیە کە پێویستە مرۆڤ بیکات، کەچی ئـەو کـارە ناکـات و کـارێکی تـر دەکات.

| Dinlen**meliyken** ağır mı ağır bir iş yaptık. کاتێ دەبوو ئیسراحەت بکەین ئیشێکی زۆر قورسمان کرد. |
|---|
| Konuş**malıyken** niye susuyorsun? کاتێ دەبێ قسە بکەیت بۆچی بێ دەنگ دەبیت؟ |
| Beni bekle**meliyken** neden gittin? کاتێ دەبێ چاوەڕێم بکەی بۆچی ڕۆیشتی؟ |
| Namaz kıl**malıyken** uyudum. کاتێ دەبوو نوێژ بکەم خەوتم. |

دووەم/ بێ ئەوەی هیچمان لەدەست بێت پێچەوانەی ئەوەی چاوەڕێی دەکەین ڕوو دەدات.

| Araba hızlan**malıyken** yavaşlıyor. ئۆتۆمبێلەکە کاتێ دەبێ خێرابێت هێواش دەبێت. |
|---|
| Sıcaktan bunal**malıyken** donuyorum sanki! کاتێ کە دەبێ بێزاربم لە گەرما خەریکە ڕەق دەبمەوە لەسەرما. |
| Kar yağ**malıyken** güneş açıyor. لەکاتێکا دەبێ بەفر بباریێ خۆرەتاوە. |
| Öğretmenimiz derse gel**meliyken** Ankara’ya gitmiş. لەکاتێکا مامۆستا دەبێ بێتە دەرس چووەتە ئەنقەرە. |

- لقی سێیەم/ ناوە فرمان (İsim-Fiil)

**ناوە فرمــان (İsim-Fiil) بریتیە لە ناوی جـوڵەو کردارەکـان،** بە هـــەر ســێ پاشگری (**-mAk/-mA/-Iş**) دەچێتە سەر ڕەگی فرمان و دەیگۆڕێت بۆ ناو. بەهۆی پاشگری (**-ma/-me**) دەبێتە نەرێ. هەرسێ پاشگرەکەشی لەڕووی ماناوە هاومانان بـەڵام لـەڕووی تایبەتەمەندیــەوە جیــاوازن، **پاشــگری (-mAk) بــۆ حاڵــەتی گشــتگیر و بــەرفراوان بەکاردێت، پاشگری (-mA) هەندێ تایبەتمەندترە بــەڵام تــۆزێ گشتگیریشــی تێدایــە، هەرچی پاشگری (-Iş)ە ئەوا تایبەتە بەکەسێك یان شتێکی دیاریکراو**.




| Fiil + -mak/-mek<br>-ma/-me<br>-(y) -ış/-iş/-uş/-üş | ئەرێ<br>(olumlu) |
|---|---|
| Fiil + -ma/-me + -mak/-mek<br>-ma/-me<br>-(y) -ış/-iş/-uş/-üş | نەرێ<br>(olumsuz) |

| Gül**mek** çok faydalıdır. | پێکەنین زۆر بەسوودە. (گشتگیر) |
|---|---|
| Koridorden bir gül**me** sesi geliyor. | لە ڕاڕاوەکەوە دەنگی پێکەنین دێت.(کەمێك تایبەتکراو) |
| Ali'nin gül**üş**ü çok güzel. | پێکەنینی عەلی زۆر جوانە. (تایبەتمەند) |

## A- پاشگری (-mAk)

یەکێکە لە پاشگرە زۆر گرنگەکانی زمانی تورکی، دەچێتە سەر ڕەگی فرمـان و دەیکاتـە نـاوێکی گشـتگیر. تـەنها دەتوانـێ پاشـگرەکانی حـاڵی **هــەبوون**(Bulunma H.) و **جیابوونەوە**(Ayrılma H.) وەربگرێت. بەپێی یاسای هەماهەنگی دەنگی بە **دوو** شـێوە دەردەکەوێت (**-mak/-mek**).

- پاشگری ناوەفرمانی (-mak/-mek) لە زمانی تورکیدا ١١ ئەرکی هەیە:

١- **پاشگری چاوگ** (Mastar)ە: **بەهۆی پاشگری (-mak/-mek) فرمانـەکان دەبنـە چاوگ.** ئەگەر بێت و ئەو پاشگرانە لابەرین فرمانەکان تەنها ڕەگیان دەمێنێتـەوەو دەبنـە شێوازی فەرمانی بۆ کەسی دووەمی تاك (Sen).

| Gör-<br>ببینە | Gör**mek**<br>بینین | Oku-<br>بخوێنەوە | Oku**mak**<br>خوێندنەوە | Yap-<br>بکە | Yap**mak**<br>کردن |
|---|---|---|---|---|---|
| Git-<br>بڕۆ | Git**mek**<br>ڕۆیشتن | Yaz-<br>بنووسە | Yaz**mak**<br>نووسین | Öl-<br>بمرە | Öl**mek**<br>مردن |

٢- **بۆ پێناسەکردن** (Tanımlama) و **باس کردنی شتی گشـتی** (Genel) و **بابـەتیی** (Nesnel) بەکاردێت.

| Sigara iç**mek** zararlıdır.<br>جگەرە کێشان زیانبەخشە. |
|---|
| Öğren**mek** ve öğret**mek** zor bir iştir.<br>فێرکردن و فێربوون کارێکی سەختە. |

| Çocuk yetiştir**mek** sadece annenin işi değildir.<br>منداڵ پێگەیاندن تەنها کاری دایك نیە. |
|---|
| Evlen**mek** sorumluluk demektir.<br>هاوسەرگیریی واتە بەرپرسیارێتی. |

٣- ڕستەی **ئامانجی دروست دەکات** (Fiil + -mAk + için).

| Bu ülkeye üniversite oku**mak için** geldik.<br>بۆ خوێندنی زانکۆ هاتووینەتە ئەم وولاتە. |
|---|
| Ali uyu**mak için** odasına çekildi.<br>عەلی بۆ نووستن چووەوە ژوورەکەی. |
| Para çek**mek için** bankamtiğe giderim.<br>بۆ پارە ڕاکێشان دەچم بۆ بانکەماتیك. |
| Karar ver**mek için** biraz düşünmeliyim.<br>بۆ بڕیاردان دەبێ کەمێك بیر بکەمەوە. |

٤- **ڕستەی هۆکاریی دروست دەکات** (Fiil + -mAktAn + dolayı)، دەتوانین ووشەی (dolayı) فڕێ بدەین و هەمان ماناش دەدات.

| Sürekli çalış**maktan dolayı** sıkıldım.<br>بەهۆی کارکردنی بەردەوامەوە بێزاربووم. |
|---|
| Çok oku**maktan** gözlerim bozulacak.<br>بەهۆی زۆر خوێندنەوە چاوانم تێك دەچن. |
| Gliba düşün**mekten** saçlarım ağaracak.<br>ڕەنگە بەهۆی بیرکردنەوە قژم سپی بێت. |
| Çok yemek ye**mekten dolayı** şişmanladım. |

| بەهۆی نان خواردنی زۆرەوە قەڵەو بووم. |
|---|

٥- **ڕستەی داخوازی دروست دەکات** (-Fiil + -mAk + iste).

| Bu kanaldaki haberleri izle**mek ist**iyoruz.<br>دەمانەوێت سەیری هەواڵەکانی ئەو کەناڵە بکەین. |
|---|
| Tüm kaynakları tara**mak ist**iyorum.<br>دەمەوێت هەموو سەرچاوەکان شەن و کەو بکەم. |
| Çok iyi Türkçe öğren**mek ist**iyorum.<br>دەمەوێت تورکیەکی زۆر باش فێربم. |
| Bir kitap al**mak ist**iyorum.<br>دەمەوێت کتێبێك بکڕم. |

٦- **ڕستەی پێویستی دروست دەکات** (Fiil + -mAk + gerek/lazım).

| Şimdi çok çalış**mak lazım**.<br>ئێستا زۆر کارکردن پێویستە. |
|---|
| Bu projeyi biraz daha geliştir**mek lazım**.<br>ئەو پڕۆژەیە پێویستی بە کەمێکی تر پێشخستنە. |
| Yaramazlık yaparsan sana ceza ver**mek gerek**iyor.<br>هاروهاجی بکەیت پێویستە سزا بدرێیت. |
| Bekçi olmak için uyu**mamak lazım**.<br>بۆ بوونە پاسەوان نەخەوتن پێویستە. |

**٧- ڕستەی زەرفی لەگەڵ کێ؟ بەچی؟** (Fiil + -mAk + ile).

| |
|---|
| Ofisimi yeneletmek ile meşgulum.<br>بە نوێ کردنەوەی ئۆفیسەکەم سەرقاڵم. |
| Murat Konuşmak ile meşgul.<br>موراد بەقسەکردن سەرقاڵە. |
| Film izlemek ile Türkçe öğrenebilirsin.<br>بە سەیرکردنی فلیم دەتوانی فێری تورکی ببیت. |
| Ders çalışmak ile meşgulduk.<br>بە دەرس خوێندن سەرقاڵ بووین. |

**٨- ناچاری و بێ بەدیلی** (Seçeneksiz, Alternatifsizlik).

**Fiil + -mAktAn başka**
**-mAk dışında**

| |
|---|
| Ameliyat olmaktan başka bir tedavi yok.<br>جگە لە عەمەلیات کردن چارەسەرێکی تر نیە. |
| Ameliyat olmak dışında bir tedavi yok.<br>جگە لە عەمەلیات کردن چارەسەرێکی تر نیە. |
| Çok çalışmaktan başka bir çaremiz var mı?<br>جگە لە زۆر خوێندن چارەیەکی ترمان هەیە؟ |
| Kitap okumak dışında bir şey yapmam.<br>جگە لە کتێب خوێندنەوە شتێکی تر ناکەم. |

٩- **ڕێك پێچەوانەكەی (لەجیاتی)** (Fiil + -mAk + yerine).

| Onlarla laklak et**mek yerine** bir iş yapmalısın.<br>لەجیاتی زۆربلێی كردن لەگەڵ ئەوان پێویستە كارێك بكەی. |
|---|
| Sürekli şikayet et**mek yerine** çözüm bulmaya çalış!<br>لەجیاتی بەردەوام سكاڵا كردن بەدوای چارەسەر بگەڕێ. |
| Spor yap**mak yerine** baklava yeme!<br>لەجیاتی وەرزش كردن پاقلاوە مەخۆ. |
| Ders çalış**mak yerine** şaka yaparlar.<br>لەجیاتی دەرس خوێندن گاڵتەجاڕی دەكەن. |

١٠- **نزیك بوونەوە** (Yaklaşma) و **ئامانج** (Amaç) (Fiil + -mAk + üzere)

| **نزیك بوونەوە (Yaklaşma)** |
|---|
| Biraz bekle ders bit**mek üzere**.<br>كەمێك چاوەڕێكە دەرس لەسەر تەواو بوونە. |
| İşimizi bitir**mek üzere**yiz.<br>كارەكانمان لەسەر تەواو بوونە. |
| Yoldayım, okula var**mak üzere**yim.<br>لەڕێگام، خەریكە دەگەمە قوتابخانە. |
| Burada akşam ol**mak üzere**.<br>لێرە خەریكە دەبێتە ئێوارە. |
| **ئامانج (Amaç)** |
| Oku**mak üzere** Türkiye'ye geldik.<br>بۆ خوێندن هاتووینەتە توركیا. |
| Kursa katıl**mak üzere** adımı kaydettirdim. |

| بۆ بەشداری کردن لە کۆرس ناوم تۆمارکرد. |
|---|
| Talebimizi sun**mak üzere** dilekçe yazmalıyız.<br>بۆ پێشکەش کردنی داواکاریەکەمان دەبێ داواکاری بنووسین. |

١١- **لەپاڵ ئەوەدا ئەوەش** (Fiil + -mAk + kadar .... Fiil + -mAk + dA).

| C١ sertifikası al**mak kadar**, Türkçe iyi öğren**mek de** önemlidir.<br>بەقەد بەدەستهێنانی بڕوانامەی C١ باش فێربوونی تورکیش گرنگە. |
|---|
| Spor yap**mak kadar**, az yemek ye**mek de** lazım.<br>بەقەد وەزرش کردن کەم نان خواردنیش پێویستە. |
| Okulu bitir**mek kadar** iyi bir iş bul**mak da** önemli.<br>بەقەد تەواوکردنی خوێندن دۆزینەوەی کارێکی باشیش گرنگە. |
| Bir işe başla**mak kadar** onu bitir**mek de** gayret ister.<br>بەقەد دەست پێکردنی کارێك تەواوکردنیشی هەوڵی دەوێ. |

## B- پاشگری (-mA)

یەکێکە لە پاشگرە گرنگەکانی ناوەفرمان لە زمانی تورکیدا، دەچێتە سەر ڕەگی فرمان و دەیکاتە ناوێکی تایبەت. **دەتوانێ هەموو پاشگرەکانی حاڵی(Hal Ekleri) و جێناوەکان(Zamirler) و تەواوکاریی ناویی(İsim Tamlaması) وەربگرێت.**

| | |
|---|---|
| Benim konuş**ma**m çok iyi. | قسەکردنم زۆر باشە. |
| Senin çalış**ma**n çok düzgün. | خوێندنی تۆ زۆر ڕێك وپێکە. |
| Onun anlat**ma**sını seviyorum. | ڕاڤەکردنی ئەوم زۆر خۆش دەوێ. |
| Bizim gel**me**mizi isterler. | دەیانەوێت ئێمە بچین. |
| Sigara iç**me**niz bizi rahatsız eder. | جگەرە کێشانتان نارەحەتمان دەکات. |
| katıl**ma**larını hiç beğenmedim. | بەشداری کردنی ئەوانم هیچ بەدڵ نەبوو. |

- لە کۆمەڵێك ناو(İsim)ی زمانی تورکیدا پاشگری (**-ma/-me**) بەقاڵب بووەو بووەتە بەشێکی جێگیرو سەربەخۆ تێیدا.

| | | | |
|---|---|---|---|
| Toplama<br>کۆکردنەوە | Çıkarma<br>لێ دەرکردن | Çarpma<br>جاران کردن | Bölme<br>دابەش کردن |
| Deneme<br>هەوڵ دان | Dolma<br>پڕکردن | Bekleme<br>چاوەڕێ کردن | Dövme<br>لێدان |
| Yazma<br>نووسین | Okuma<br>خوێندنەوە | Konuşma<br>قسەکردن | Dinleme<br>گوێ گرتن |
| Dondurma<br>دۆندرمە | Sarma<br>پێچانەوە | Yüzme<br>مەلەوانی | Şekerleme<br>شیرینی |
| Haşlama<br>کوڵاندن | Basma<br>چاپ | Çalışma odası<br>ژووری کار | Arama<br>گەڕان |

| Barınma şartları<br>هەلومەرجی نیشتەجێ بوون | Dinlenme sitesi<br>شوێنی حەسانەوە |
| --- | --- |

- پاشگری (-ma/-me) بەشێوەیەکی بەرفراوان لەگەڵ ئامرازەکان بەکاردێت لەوانەش:

| **Fiil + -mA + iyelik eki + için**<br>Düşünmem için biraz zaman verin.<br>بۆ بیرکردنەوەم کەمێك کات بدەن. |
| --- |
| **Fiil+-mA+(iyelik eki)In+öncesinde/sonrasında**<br>Konuşmamın öncesinde herkesi selamladım.<br>پێش قسەکردنم سلاوم لە هەمووان کرد. |
| **Fiil + -mA + (iyelik eki)la + birlikte**<br>Evine girmesiyle birlikte tüm sıkıntıları attı.<br>لەگەڵ چوونە ماڵەکەی هەموو کێشەکانی وەلانا. |
| **Fiil+-mA+ iyelik eki+ üzerine/konusunda/hakkında**<br>Ailemle yurt dışına gitmem üzerine konuşacağım.<br>دەربارەی چوونم بۆ دەرەوەی وولات لەگەڵ خێزانەکەم دەدوێم. |
| **Fiil + -mA + iyelik eki + dolaysıyla / sebebiyle**<br>Başarmam dolaysıyla herkes beni kutladı.<br>بەبۆنەی سەرکەوتنمەوە هەمووان پیرۆزباییان لێ کردم. |
| **Fiil + -mA + iyelik eki + -A ragmen/karşın**<br>Yeterince uyumama rağmam henüz yorgunum.<br>سەرباری خەوتنی پێویست هێشتا ماندووم. |
| **Fiil+ -mA+ iyelik eki+ ile + Fiil+ -mA+ iyelik eki**<br>Ali’nin yatağa uzanması ile uyuması bir oldu.<br>عەلی پاڵدانەوەو خەوتنی لەسەر جێگا بوو بە یەك. |
| **Fiil+-mA+iyelik eki +kadar+Fiil+-mA+iyelik eki+dA**<br>Kelimeleri okuyabilmen kadar yazabilmen de önemli.<br>بەقەد توانینی خوێندنەوەی ووشەکان توانینی نووسینیشت گرنگە. |

| **Fiil + -mA + iyelik eki + bile / dahi**<br>Müdürle konuşması bile faydası yok.<br>تەنانەت قسەکردنی لەگەڵ بەڕێوەبەریش سوودی نیە. |
|---|
| **Fiil + -mA + iyelik eki + -DAn ötürü**<br>Okulu temizlememizden ötürü bize teşekkür ettiler.<br>بەبۆنەی پاککردنەوەی قوتابخانەکە سوپاسیان کردین. |
| **Fiil + -mAyA + yönelik**<br>Şu anki tedavi, hastalığın durdurmaya yönelik.<br>چارەسەریی ئێستاکە بۆ وەستاندنی نەخۆشیەکەیە. |
| **Fiil + -mAyA + değer / değmez**<br>Bu konu üzerinde durmaya değmez.<br>ئەو بابەتە ئەوە ناهێنێ لەسەری بوەستین. |

## C- پاشگری (-Iş)

ئەم پاشگرە بە **چوار** شێوە دەردەکەوێ (**-ış/-iş/-uş/-üş**). دەچێتە سەر ڕەگی فرمان و **دەیکاتە ناوێکی تەواو تایبەت** بە کەسێك یان شتێك. هەروەها بۆ شتی کاتی و ماوە کورت بەکاردێت. دەتوانێ هەموو **پاشگرەکانی حاڵی**(Hal Ekleri) و **جێناوەکان**(Zamirler) و **تەواوکاریی ناویی**(İsim Tamlaması) وەربگرێت.

| | |
|---|---|
| Davran**ış**ınız takdire değer. | هەڵسوکەوتتان شایانی ڕێزە. |
| Rüzgarın es**iş**i çok kuvvetli. | هەڵکردنی باکە زۆر توندە.(کاتی) |
| Ali’nin ders anlat**ış**ı çok zayıf. | عەلی ڕاڤەکردنی دەرسی زۆر لاوازە. |
| Onun yiy**iş**ine hepimiz güldük. | هەمووومان بە خواردنەکەی ئەو پێکەنین. |
| Anlay**ış**ınız için teşekkür ederiz. | بۆ تێگەیشتووییتان سوپاستان دەکەین. |
| Bu kalemin yaz**ış**ı daha iyi. | نووسینی ئەو پێنووسە باشترە. |
| Çık**ış** kapısında beni bekleyin. | لە دەرگای دەرچووندا چاوەڕێم بکەن. |

- هەندێ ناو بەهۆی ئەم پاشگرەوە دروست بوونە و بوونەتە ناوێکی سەربەخۆی جێگیر.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Giriş<br>چوونە ژوورەوە | Çıkış<br>دەرچوون | Gidiş<br>چوون | Dönüş<br>گەڕانەوە | İnanış<br>باوەڕ |
| Kalkış<br>هەڵسان | İniş<br>دابەزین | Biniş<br>سواربوون | Varış<br>گەیشتن | Yürüyüş<br>ڕۆیشتن |
| Alış<br>کڕین | Satış<br>فرۆشتن | Bitiş<br>کۆتایی | Veriş<br>دان | Davranış<br>هەڵسوکەوت |
| Batış<br>ئاوابوون | Doğuş<br>هەڵاتن | Öpüş<br>ماچ | Gülüş<br>پێکەنین | Vuruş<br>لێدان |

- باســكردنى ڕاســتەوخۆ- ناڕاســتەوخۆ ( Doğrudan-Dolaylı Anlatım)

**بریتیە لە گواستنەوەی دەقی قسەو ئاخاوتنی کەسێك بۆ کەسێکی تر بە ڕستە و داڕشتنی خۆمان**، ئەمەش چوار جۆری هەیە:

A- **باسـکردنی ناڕاسـتەوخۆ لـە ڕسـتەی فرمـانی** ( Fiil Cümlesinde Dolaylı Anlatım). بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە قسەی کەسەکە دادەڕێژینەوەو بۆ کەسێکی تری باس دەکەین:

**Fiil + -DIk/-AcAk + iyelik eki + belirtme hali.**

- لەکاتی وەرگێڕانی ڕستە لە ڕاســتەوخۆ(Doğrudan)ەوە بــۆ ناڕاســتەوخۆ(Dolaylı) دەبێ ئاگاداری ئەو خاڵانە بین:

١- ئەگەر فرمانی ڕستەکە کاتی ڕابردوو(Geçmiş Z.) یـان کـاتی ئێسـتا( Şimdiki Z.) بێت ئەوا (**-DIk**) بەکاردێنین. ئەگەر فرمانەکە کاتی داهاتوو(Gelecek Z.) بێت (**-AcAk**) بەکاردێنین. سەبارەت بە کاتی بەرفراوان(Geniş Z.) ئەوا دەوەسـتێتە سـەر مانای ڕستەکە، ئەگەر بەمانای ڕابردوو بوو ئەوا (-DIk) بەکاردێت، ئەگەریش بـەمانای داهاتوو بوو (-AcAk) بەکاردەهێنرێت.

٢- ڕستەکان لە نێو کەوانەکان دەردەهێنین و کەوانەکان فڕێ دەدەین.

٣- هەندێ جـار جێنـاوە خاوەندارێتیـەکان لـەنێوان ڕسـتەی ڕاسـتوخۆ و ناڕاسـتەوخۆدا گۆڕانیـان بەسـەردا دێـت دەبێـت ئاگـاداری بـین، تەنانـەت هەنـدێ جـار پێویسـت بـە زیادکردنیشی دەکات، بۆ نمونە:

| Annem, Ali’ye “Çok aburcubur yiyor<u>**sun**</u>” dedei.<br>دایكم به عەلی گووت "شەكەراتی زۆر دەخۆیت" |
| --- |
| Annem, Ali’ye Çok aburcubur yediğ<u>**i**</u>ni söyledi.<br>دایكم زۆری شەكەرات خواردنی به عەلی گووت. |

٤- له ڕستەی ڕاستەوخۆدا بەگشتی ووشەی (**dedi**) زۆر بەكاردێت. لـەكاتی وەرگێڕانـی بۆ ڕستەی ناڕاستەوخۆ ووشەكە دەگۆڕین بۆ (**söyledi**).

| ڕاستەوخۆ (**Doğrudan**) | ناڕاستەوخۆ (**Dolaylı**) |
| --- | --- |
| Mehmet bana “Geçen yıl London’a **gittim**” dedi. *Geçmiş*<br>محمد پێی گووتم "ساڵی ڕابردوو چوومە لەندەن." | Mehmet bana geçen yıl London’a gittiğini söyledi.<br>محمد چوونە لەندەنی ساڵی ڕابردووی پێ گووتم. |
| Aso, Ali’ye “Dersten sonra tatlı yemeğe **gideriz**” demiş. *Geniş*<br>ئاسۆ به عەلی گووت "دوای دەرس دەچینە شیرینی خواردن" | Aso, Ali’ye dersten sonra tatlı yemeğe gideceklerini söylemiş.<br>ئاسۆ چوونی دوای دەرسیان بۆ شیرینی خواردن به عەلی گووت. |
| Runa, bize “Kıyafetlerimi kendim **dikerim**” dedi. *Geniş*<br>ڕوونە گووتی"جلوبەرگەكانم بەخۆم دەدرووم" | Runa, bize kıyafetlerini kendisinin diktiğini söyledi.<br>ڕوونە، خۆی دروینی جلوبەرگەكانی خۆی به ئێمە گووت. |
| Babam “spor **yapmıyorum**” dedi. *Şimdiki*<br>باوكم گووتی "وەرزش ناكەم" | Babam spor yapmadığını söyledi.<br>باوكم وەرزش نەكردنی گووت. |
| Cumhurbaşkanı, halka “Türkiye’yi **geliştireceğiz**” dedi. *Gelecek*<br>سەركۆمار بەخەڵكی گووت "توركیا پێش دەخەین" | Cumhurbaşkanı Türkiye’yi geliştireceklerini söyledi.<br>سەركۆمار پێشخستنی توركیای بەخەڵك گووت. |

B- **باسـکردنی ناڕاسـتەوخۆ لـە ڕسـتەی نـاویی** ( İsim Cümlesinde Dolaylı Anlatım)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە قسەی کەسەکە دادەڕێژینەوەو بۆ کەسێکی تری باس دەکەین:

| **İsim + ol- + -DIk + iyelik eki + belirtme hali.** |
|---|

لەکاتی گۆڕینی ڕستەی ڕاستەوخۆ بۆ ناڕاستەوخۆ ووشـەکانی (**var/yok**) دەگـۆڕین بـۆ (**ol-**).

| **ناڕاستەوخۆ (Dolaylı)** | **ڕاستەوخۆ (Doğrudan)** |
|---|---|
| Aso, kardeşine yalancı olduğunu söyledi.<br>ئاسۆ درۆزن بوونی براکەی بە براکەی گوت. | Aso, kardeşine "**Yalancısın**" dedi.<br>ئاسۆ بە براکەی گوت: درۆزنیت. |
| Müşteri, garsona yemeğinin çok tuzlu olduğunu söyledi.<br>کڕیار زۆر سوێر بوونی خواردنەکەی بە گارسۆن گووت. | Müşteri, garsona "Yemeğin **çok tuzlu**" dedi.<br>کڕیار بە گارسۆنەکەی گووت: خواردنەکەت زۆر سوێرە. |
| Songül, bana bugün hava yağmurlu oduğunu haber verdi.<br>سۆنگول باراناوی بوونی هەوای ئەمڕۆی پێ گووتم. | Songül, bana "Bugün **hava yağmurlu**" dedi.<br>سۆنگول پێی گووتم: ئەمڕۆ هەوا باراناویە. |
| Can bu akşam yemekte tavuk olduğunu söyledi.<br>جان هەبوونی مریشکی لە خواردنەکەی ئەم ئێوارەیەدا گووت. | Can "Bu akşam yemekte **tavuk var**" dedi.<br>جان گووتی: ئەم ئێواریە لەخواردنەکەدا مریشك هەیە. |

C- **باسکردنی ناڕاستەوخۆ لە ڕستەی فەرمانی-ئەمر-** ( Emir Cümlesinde Dolaylı Anlatım)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە فەرمانی کەسەکە دادەڕێژینەوەو بۆ کەسێکی تری باس دەکەین:

**Fiil + -mA + iyelik eki + belirtme hali.**

پاشگری (-ma/-me)ی دوای فرمانەکە(Fiil) بریتیە لە پاشگری ناوەفرمان(-İsim Fiil) نەك پاشگری نەرێ.

| ڕاستەوخۆ (Doğrudan) | ناڕاستەوخۆ (Dolaylı) |
|---|---|
| Annem, bana “Odanı **topla**!” dedi.<br>دایکم پێی گووتم: ژوورەکەت کۆکەرەوە. | Annem bana odamı toplamamı söyledi.<br>دایکم کۆکردنەوەی ژوورەکەمی پێ گووتم. |
| Öğretmen, bize “Derse erken **gelin**!” dedi.<br>مامۆستا پێمانی گووت: زوو وەرن بۆ دەرس. | Öğretmen, bize derse erken gelmemizi söyledi.<br>مامۆستا زوو هاتنمانی بۆ دەرس پێ گووتین. |
| Ali, Aso’ye “Burada sigara **içme**!” dedi.<br>عەلی بە ئاسۆی گووت: لێرە جگەرە مەکێشە. | Ali, Aso’ye burada sigara içmemesini söyledi.<br>عەلی بە ئاسۆی گووت لێرە جگەرە نەکێشێ. |
| Hoca, Ayşe’ye “**Uyuma**!” dedi.<br>مامۆستا بە ئایشەی گووت: مەخەوە. | Hoca, Ayşe’ye uyumamasını söyledi.<br>مامۆستا بە ئایشەی گووت نەخەوێت. |
| Karım, bana “Lütfen **gelsin**!” dedi.<br>هاوسەرم پێی گووتم: تکایە بابێت. | Karım, bana gelmesini söyledi.<br>هاوسەرم هاتنی ئەوی پێ گووتم. |

- لــــەکاتی وەرگێـــــڕان لـــــە ڕاســــتەوخۆ بــــۆ ناڕاســــتەوخۆ **ووشــــەکانی وەك (Lütfen/Haydi/Sakın) لادەبەین.**

D- **باسکردنی ناڕاستەوخۆ لە ڕســتەی پرســیاریی** ( Soru Cümlesinde Dolaylı Anlatım)، بەپێی ئەم یاسایەی خوارەوە پرسیاری کەسەکە دادەڕێژینەوەو بــۆ کەســێکی تری باس دەکەین:

| **Fiil + -Ip + Fiil + -mA + -DIk/-AcAk + iyelik eki + belirtme hali.** |
|---|

تێبینی:

١- **تەنها ئەو ڕستە پرسانەی کە پاشگرە پرســەکانی (-mı/-mi/-mu/-mü) تێدایــە بەو یاسایەی سەرەوە دەگۆڕدرێن بۆ ڕستەی ناڕاستەوخۆ**، هەرچی ئەو ڕستانەن کە ووشــە پرســەکانی وەك (Ne kadar/Neden/Ne zaman) یــان تێدایــە ئەوانــە دەبــێ بــە یاساکانی ڕستەی فرمانی یان ناوی بگۆڕدرێن بۆ ناڕاستەوخۆ.

٢- بەپێی یاسای ڕستەی پرسیاری دەبێ فرمــانی ڕســتەکە دووجــار بنووســینەوە، جــاری یەکەم پاشگری (-Ip) دەخەینە سەر و جــاری دووەمــیش ( + -mA + -DIk/-AcAk iyelik eki + belirtme hali).

٣- بۆ کاتەکانی ڕابردوو و ئێستا پاشــگری (-DIk) بــەکاردێت، بــۆ کــاتی داهــاتوو (-AcAk)، بۆ کاتی بەرفراوانیش بەپێی ماناکەی دەتوانێ هەردوو پاشــگری (-DIk) و (-AcAk) وەربگرێت.

| **(Doğrudan) ڕاستەوخۆ** | **(Dolaylı)ناڕاستەوخۆ** |
|---|---|
| Annem, bana “Okula **gidiyor** | Annem, bana okula gidip |

| | |
|---|---|
| **musun**?” diye sordu.<br>دایکم لیّی پرسیم: دەچیتە قوتابخانە؟ | gitmediğimi sordu.<br>دایکم چوون و نەچوونمی بۆ قوتابخانە لێ پرسیم |
| Polis, şoföre “Ehliyetiniz **var mı**?” diye sordu.<br>پۆلیس لە شوفێرەکەی پرسیی: مۆڵەتتان هەیە؟ | Polis, şoföre ehliyetinin olup olmdığını sordu.<br>پۆلیس هەبوون و نەبوونی مۆڵەتی لە شوفێرەکە پرسی. |
| Can, Ayşe’ye “Benimle **gelir misin**?” diye sordu.<br>جان لە ئایشەی پرسی: لەگەڵ من دێیت؟ | Can, Ayşe’ye onunla gelip gelmeyeceğini sordu.<br>جان هاتن و نەهاتنی ئایشەی لەگەڵی لێ پرسی. |
| Müdür, memura “Beni **arayacak mısın**?” diye sordu.<br>بەڕێوەبەر لە فەرمانبەرەکەی پرسی: پەیوەندیم پێوە دەکەیت؟ | Müdür, memura onu arayıp aramayacağını sordu.<br>بەڕێوەبەر پەیوەندی کردن و نەکردنی لە فەرمانبەرەکەی پرسی. |

- هەر چوار جۆرەکەی ڕابردوو دەشێ بەپێچەوانەوە لە ڕستەی ناڕاستەوخۆوە بۆ ڕستەی ڕاستەوخۆ وەربگێڕدرێن.

## • کات و شێوازی لێکدراو (Birleşik Zamanlar / Kipler)

**بریتیە لە تێکەڵکێش کردنی دوو زەمەن یان زەمەنێك و شێوازێك بە مەبەستی خستنەڕووی ووردەکاری و زانیاری زیاتر لەڕستەدا**. لە ڕێزمانی کوردیشدا هەمان شێواز بەناوی(کاتی بەردەوام) بوونی هەیە. بابەتی کات و شێوازی لێکدراو لە زمانی تورکیدا سێ جۆری سەرەکی هەیە، هەر یەك لەو سیانەش لەگەڵ زەمەن و شێوازەکانی تر تێکهەڵکێش دەکرێن و مانای نوێ دەدەن بەدەستەوە.

| Hikaye Birleşik Zamanlar/Kipler. (-DI)<br>کات و شێوازی لێکدراوی چیرۆکی. |
|---|
| Rivayet Birleşik Zamanlar/Kipler. (-mIş)<br>کات و شێوازی لێکدراوی ڕیوایەتی |
| Şart Birleşik Zamanlar/Kipler. (-sA)<br>کات و شێوازی لێکدراوی مەرجی |

## A- لێکدراوی چیرۆکی (Hikaye Birleşik Zamanlar/Kipler)

**قسەکەر خۆی ڕووداوەکەی بینیووە**، بەهۆی تێکەڵکێشکردنی پاشگری ڕابردووی بینراوو (-DI) لەگەڵ پاشگری زەمەن و شێوازەکانی تری زمانی تورکی دروست دەبێت.

| Fiil + Zaman/kip ekleri + -DI + Şahıs eki. | Olumlu |
|---|---|
| Fiil + -mA + Zaman/kip ekleri + -DI + Şahıs eki. | Olumsuz |
| Fiil + Zaman/kip ekleri + mI + (y) -DI + Şahıs eki ? | Olumlu Soru |
| Fiil + mI + Zaman/kip ekleri + mI + (y) -DI + Şahıs eki? | Olumsuz soru |

## ١- کاتی ئێستای چیرۆکی (Şimdiki Zamanın Hikayesi)

**لەڕابردوودا کارێکمان کردووە کە ماوەیەکی کورت بەردەوام بووەو پاشان کۆتایی پێ هاتووە، پاشگرەکەی (-yordu)ە.**

| ئەرێ Olumlu | نەرێ Olumsuz | پرسیاری ئەرێ Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Geliyordum دەهاتم | Gelmiyordum نەدەهاتم | Geliyor muydum? دەهاتم؟ | Gelmiyor muydum? نەدەهاتم؟ |
| Geliyordun دەهاتیت | Gelmiyordun نەدەهاتیت | Geliyor muydun? دەهاتیت؟ | Gelmiyor muydun? نەدەهاتیت؟ |
| Geliyordu دەهات | Gelmiyordu نەدەهات | Geliyor muydu? دەهات؟ | Gelmiyor muydu? نەدەهات؟ |
| Geliyorduk دەهاتین | Gelmiyorduk نەدەهاتین | Geliyor muyduk? دەهاتین؟ | Gelmiyor muyduk? نەدەهاتین؟ |
| Geliyordunuz دەهاتن | Gelmiyordunuz نەدەهاتن | Geliyor muydunuz? دەهاتن؟ | Gelmiyor muydunuz? نەدەهاتن؟ |
| Geliyordular Geliyorlardı دەهاتن | Gelmiyordular Gelmiyorlardı نەدەهاتن | Geliyor muydular? Geliyorlar mıydı? دەهاتن؟ | Gelmiyor muydular? Gelmiyorlar mıydı? نەدەهاتن؟ |

تێبینی: لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

| |
|---|
| Yeni öğrendiğim kelimelri tekrarlı**yordu**m.<br>ئەو ووشە نوێیانەی فێری ببووم دووبارەم دەکردەوە. |
| Gençken ara sıra futbol oynu**yordu**m.<br>لەکاتی لاوی جارجار تۆپی پێم دەکرد. |
| Sınavdan önce hiç çalış**mıyordu**k.<br>پێش تاقی کردنەوە هیچ نەماندەخوێند. |
| A١'de pek iyi Türkçe'yi anla**mıyordu**m.<br>لە A١ دا زۆر باش لە تورکی نەدەگەیشتم. |
| Toplantıdan böyle bir sonuç bekli**yor muydun**?<br>چاوەڕێی ئەنجامێکی ئاواتان لە کۆبوونەوەکە دەکرد؟ |
| Az önce ikiniz konuşu**yor muydunuz**?<br>کەمێك لەمەوبەر هەردووکتان قسەتان دەکرد؟ |
| Az önce yemek ye**miyor muydunuz**?<br>ئەی کەمێ لەمەوبەر نانتان نەدەخوارد؟ |
| İnternet hızlı çalış**mıyor muydu**?<br>ئەی ئینتەرنێت خێرا کاری نەدەکرد؟ |

- ئامراز و ووشەی پرسی کوانێ؟ (**Hani?**) لەزمانی تورکیـدا لەگـەڵ (**-yordu**) و (**-AcAktı**) بەکاردێت، کاتێ کەسێ شتێك دەڵێ بەڵام دواتر نایکـات یـان پێچـەوانەکەی دەکات، کەسی بەرامبەر بەشێوەی تەنزئامێز بەبیری دەهێنێتەوە.

| |
|---|
| (Ev çöplük gibi hala) Hani temizlik yapıyordun?<br>کوانێ پاککردنەوەت دەکرد؟ (هێشتا ماڵەکە وەك زبڵدانە) |

| (Soğuktan hasta oldum) Hani hava sıcak oluyordu?<br>کوانێ هەوا گەرم دەبوو؟ (لەسەرما نەخۆش کەوتم) |
|---|
| (çok yorgunsun) Hani bugün çalışmıyordun?<br>کوانێ ئەمڕۆ کارت نەدەکرد؟ (زۆر ماندوویت) |
| (Tabağınızda hiç kalmamış) Hani yemek yemiyordunuz?<br>کوانێ نانتان نەدەخوارد؟ (خۆ لە قاپەکانتان هیچ نەمایەوە) |

## ٢- کاتی بەرفراوانی چیرۆکی (Geniş Zamanın Hikayesi)

**لەماوەی ڕابردوودا کارێکمان کردووە کە ماوەیەکی زۆری خایاندووەو بەردەوام بووەو پاشان کۆتایی پێ هاتووە. پاشگرەکەی (-rdI/-ArdI/-IrdI/-mAzdI) ە.**

| ئەرێ<br>(Olumlu) | نەرێ<br>(Olumsuz) | پرسیاری ئەرێ<br>(Olumlu Soru) | پرسیاری نەرێ<br>(Olumsuz Soru) |
|---|---|---|---|
| İçerdim<br>دەمخواردەوە | İçmezdim<br>نەمدەخواردەوە | İçer miydim?<br>دەمخواردەوە؟ | İçmez miydim?<br>نەمدەخواردەوە؟ |
| İçerdin<br>دەتخواردەوە | İçmezdin<br>نەتدەخواردەوە | İçer miydin?<br>دەتخواردەوە؟ | İçmez miydin?<br>نەتدەخواردەوە؟ |
| İçerdi<br>دەیخواردەوە | İçmezdi<br>نەیدەخواردەوە | İçer miydi?<br>دەیخواردەوە؟ | İçmez miydi?<br>نەیدەخواردەوە؟ |
| İçerdik<br>دەمانخواردەوە | İçmezdik<br>نەماندەخواردەوە | İçer miydik?<br>دەمانخواردەوە؟ | İçmez miydik?<br>نەماندەخواردەوە؟ |
| İçerdiniz<br>دەتانخواردەوە | İçmezdiniz<br>نەتاندەخواردەوە | İçer miydiniz?<br>دەتانخواردەوە؟ | İçmez miydiniz?<br>نەتاندەخواردەوە؟ |

| İçerdiler<br>İçerlerdi<br>دەیانخواردەوە | İçmezdiler<br>İçmezlerdi<br>نەیاندەخواردەوە | İçer miydiler?<br>İçerler miydi?<br>دەیانخواردەوە؟ | İçmez miydiler?<br>İçmezler miydi?<br>نەیاندەخواردەوە؟ |
|---|---|---|---|

تێبینی: لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**)دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

| | |
|---|---|
| Daha önce çok sigara iç**erdi**m. | پێشتر جگەرەم زۆر دەکێشا. |
| Arapça metinleri çevir**irdi**n. | تێکستی عەرەبیت وەردەگێڕا. |
| Eskiden bunca konuş**mazdı**n. | پێشتر ئەوەندە قسەت نەدەکرد. |
| Hani sen hiç kahve iç**mezdi**n! | کوانێ تۆ هیچ قاوەت نەدەخواردەوە! |
| Her gün rapor ver**ir miydiniz**? | هەموو ڕۆژێك ڕاپۆرتتان دەدا؟ |
| Önceleri müziği sev**er miydi**? | پێشتر حەزی لە مۆسیقا هەبوو؟ |
| Bu ağaç meyve ver**mez miydi**? | ئەو دارە میوەی نەدەدا؟ |

- بۆ دەربڕینی خەملاندن(Tahmin) و بەباشتر دانان(Tercih) و بیرۆکە(Fikir) ئەم قاڵبانە بەکاردەهێنرێن:

| |
|---|
| **Ben olsam** yeşil bir takım giyerdim.<br>من بومایە قاتێکی سەوزم لەبەر دەکرد. |
| **Sen olsan** bu teklifi Kabul etmezdin.<br>تۆ بویتایە ئەو پێشنیارەت قەبوڵ نەدەکرد. |
| **Ali olsa** bu konuya fazla takılmazdı.<br>عەلی بوایە لەوە زیاتر خۆی بەو بابەتەوە سەرقاڵ نەدەکرد. |
| **Biz olsak** bu parayı harcardık. |

| ئێمە بوینایە ئەو پارەیەمان خەرج دەکرد. |
|---|
| **Siz olsanız** bu olaya dayanmazdınız.<br>ئێوە بونایە بەرگەی ئەو ڕووداوەتان نەدەگرت. |
| **Onlar olsalar** beni sever miydiler?<br>ئەوان بونایە منیان خۆش دەویست؟ |

## ٣- ڕابردووی بینـراوی چـیرۆکی ( Görülen Geçmiş Zamanın Hikayesi):

**لەماوەی ڕابردوودا کارێك کراوەو کەسی قسەکەر و گوێگر هـەردووکیان شـایەتی ئـەو ڕووداوە بوونەو بینویانە و پاشگرەکەشی (DIydI-)ە. بـەڵام ئـەم شـێوازە لـە زمـانی تورکیدا بەکارناهێنرێت و شێوەیەکی ناکردارییە.** تەنها وەك یاسا بوونی هەیـە، لـەجیاتی ئەوە شێوازی (ڕابردووی بیستراوی چیرۆکی mIştI-) بەکاردەهێنرێت کە لە خوارەوە باسی دەکەین.

## ٤- ڕابردووی بیستراوی چیرۆکی ( Duyulan Geçmiş Zamanın Hikayesi):

**ئەم جۆرەیان ئەرکی ڕابردووی دووری هەیە. دوو ڕووداو هـەن بـەڵام یـەکێکیان پێشـتر ڕوویداوە (دوورەترە)، بۆ باسکردنی ئەم ڕووداوە دوورە ئەم شـێوازە بـەکار دەهێنرێـت، پاشگرەکەشی (mIştI-)یە.**

| ئەرێ<br>Olumlu | نەرێ<br>Olumsuz | پرسیاری ئەرێ<br>Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ<br>Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Gelmiştim<br>هاتبووم | Gelmemiştim<br>نەهاتبووم | Gelmiş miydim?<br>هاتبووم؟ | Gelmemiş miydim?<br>نەهاتبووم؟ |
| Gelmiştin<br>هاتبوویت | Gelmemiştin<br>نەهاتبوویت | Gelmiş miydin?<br>هاتبوویت؟ | Gelmemiş miydin?<br>نەهاتبوویت؟ |
| Gelmişti<br>هاتبوو | Gelmemişti<br>نەهاتبوو | Gelmiş miydi?<br>هاتبوو؟ | Gelmemiş miydi?<br>نەهاتبوو؟ |
| Gelmiştik<br>هاتبووین | Gelmemiştik<br>نەهاتبووین | Gelmiş miydik?<br>هاتبووین؟ | Gelmemiş miydik?<br>نەهاتبووین؟ |
| Gelmiştiniz<br>هاتبوون | Gelmemiştiniz<br>نەهاتبوون | Gelmiş miydiniz?<br>هاتبوون؟ | Gelmemiş miydiniz?<br>نەهاتبوون؟ |
| Gelmiştiler<br>Gelmişlerdi<br>هاتبوون | Gelmemiştiler<br>Gelmemişlerdi<br>نەهاتبوون | Gelmiş miydiler?<br>Gelmişler miydi?<br>هاتبوون؟ | Gelmemiş miydiler?<br>Gelmemişler miydi?<br>نەهاتبوون؟ |

تێبینی: لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

| Stadyuma gittik, ama tüm koltuklar dol**muştu**.<br>چووینە یاریگا، بەڵام هەموو کورسیەکان پڕ ببوون. |
|---|

| |
|---|
| Sabah uyandığımda kardeşim kahvaltıyı çoktan hazırla**mıştı.**<br>بەیانی کاتێ بێداربوومەوە براکەم دەمێك بوو نانی بەیانی ئامادە کردبوو. |
| Polis mağazaya ulaştığında hırsızlar kaç**mıştı.**<br>کاتێ پۆلیس گەیشتە فرۆشگاکە دزەکان ڕایان کردبوو. |
| O sene kışın hiç kar yağ**mamıştı**, çok üzül**müştü**k.<br>زستانی ئەو ساڵی هیچ بەفر نەباریبوو، زۆر دڵتەنگ ببووین. |
| Böyle düzenli kütüphaneyi gör**memişti**m.<br>کتێبخانەیەکی ئاوا ڕێك و پێکم نەبینیبوو. |
| Aradığım hiçbir şeyi bula**mamıştı**m, şaşırdım bu işe!<br>نەمتوانی بوو هیچ شتێك بدۆزمەوە لەوەی بەدوای دەگەڕام، سەرم سوڕما! |
| Soruları görünce şaşır**mış mıydınız** ?<br>ئایا دوای بینینی پرسیارەکان سەرسام ببوون؟ |
| Devlet size burs imkanı sağla**mış mıydı** ?<br>ئایا دەوڵەت سکۆڵەرشیپی بۆ دەستەبەر کردبوون؟ |
| Siz ortağınıza güven**memiş miydiniz** ?<br>ئێوە متمانەتان بەیەکتر نەکردبوو؟ |

## ٥- کاتی داهاتووی چیرۆکی (Gelecek Zamanın Hikayesi)

**لەماوەی ڕابردوودا پلانێك، بڕیارێك، کارێك، قسەیەك...دەمانویست بیکەین و بیڵێین، بەڵام بەهەر هۆکارێك بێت نەمان کردووەو نەمان گوتوە، لەحاڵەتی نەرێشیدا بەپێچەوانەوە ویستومانە نەیکەین و نەیڵێین بەڵام بەهەر هۆکارێك بێت کردوومانە و گوتومانە، پاشگرەکەشی (AcAktı-)یە.**

| ئەرێ (Olumlu) | نەرێ (Olumsuz) | پرسیاری ئەرێ Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Verecektim دەمدا(بەڵام) | Vermeyecektim نەم دەدا | Verecek miydim? دەمدا؟ | Vermeyecek miydim? نەم دەدا؟ |
| Verecektin دەتدا | Vermeyecektin نەت دەدا | Verecek miydin? دەتدا؟ | Vermeyecek miydin? نەت دەدا؟ |
| Verecekti دەیدا | Vermeyecekti نەی دەدا | Verecek miydi? دەیدا؟ | Vermeyecek miydi? نەی دەدا؟ |
| Verecektik دەماندا | Vermeyecektik نەمان دەدا | Verecek miydik? دەماندا؟ | Vermeyecek miydik? نەمان دەدا؟ |
| Verecektiniz دەتاندا | Vermeyecektiniz نەتان دەدا | Verecek miydiniz? دەتاندا؟ | Vermeyecek miydiniz? نەتان دەدا؟ |
| Verecektiler Vereceklerdi دەیاندا | Vermeyecektiler Vermeyeceklerdi نەیان دەدا | Verecek miydiler? Verecekler miydi? دەیاندا؟ | Vermeyecek miydiler? Vermeyecekle r miydi? نەیان دەدا؟ |

تێبینی:

یەکەم- لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

دووەم- مانای ئەم شێوازە لەزمانی کوردیدا بەم شێوەیە دەبێت **(دەمکرد بەڵام.../ دەمویست بکەم بەڵام...)**، **(نەم دەکرد بەڵام.../ نەمدەویست بدەم بەڵام...)**.

| Kuş uç**acaktı**, avcı onu öldürdü.<br>باڵندەکە دەفڕی (دەیویست بفڕێ)، ڕاوچی ئەوی کوشت. |
|---|
| Alışverişe çık**acaktı**m ama zaman bulamadım.<br>دەچوومە بازاڕکردن (دەمویست بچم) بەڵام کاتم نەدۆزیەوە. |
| Sözleşmeyi imzalay**acaktı**k ancak karşı taraf gelmedi.<br>ڕێککەوتننامەکەمان واژوو دەکرد بەڵام لایەنی بەرامبەر نەهات. |
| Hoca kızmasaydı derse gir**meyecekti**m.<br>مامۆستا تووڕە نەبووایە دەمویست نەچمە دەرسەوە. |
| Evlen**meyecekti**m, ama babm istediği için evlendim.<br>هاوسەرگیریم نەدەکرد بەڵام لەبەر ویستی باوکم کردم. |
| Bu gazeteyi okuy**acak mıydın**?<br>ئەو ڕۆژنامەیەت دەخوێندەوە؟ |
| Okula uğray**acak mıydınız**?<br>سەردانی قوتابخانەکەتان دەکرد؟ |
| Runa bu hafta dön**meyecek miydi**?<br>ڕوونە ئەو هەفتەیە نەدەگەڕایەوە؟ |
| Sen çay iç**meyecek miydin**?<br>تۆ چایت نەدەخواردەوە (نەتدەویست بیخۆیتەوە)؟ |

سێیەم- بۆ زیاتر بەهێزکردنی ڕستەکە دەتوانرێت لە سەرەتای ڕەستەی یەکەم ووشەی (**Tam**) دابنرێت، وە دەتوانرێ لەنێوان هەردوو ڕستەکەدا بەستەری (**Ki**) دابنرێت.

| **Tam** pikniğe gid**ecekti**k, yağmur başladı.<br>ڕێك کە دەچووینە (دەمانویست بچینە) سەیران، باران دەستی پێکرد. |
|---|
| Pikniğe gid**ecekti**k **ki** yağmur başladı.<br>دەچووینە سەیران(دەمانویست بچین) کە باران دەستی پێکرد. |

چوارەم- کەمێکی مابوو ڕووبدات، خەریك بوو ڕووبدات، (Neredeyse / az kalsın / az kaldı / az daha).

| Hızlı giden araba **neredeyse** adama çarp**acaktı**. |
|---|
| ئۆتۆمبێلە خێراکە خەریك بوو لە پیاوەکەی دەدا.(بەڵام لێی نەدا) |
| Ameliyat olmasaydı **az kalsın** öl**ecekti**. |
| گەر نەشتەرگەری نەکرایە خەریك بوو دەمرد. |
| **Az kaldı** ikinci rüyayı gör**ecekti**. |
| خەریك بوو خەونی دووەمی دەبینی.(بەڵام نەیبینی) |

پێنجەم- ئامراز و ووشەی پرسی کوانێ (**Hani?**) لەگەڵ (-yordu) و (-AcAktı) بەکاردێت، کاتێ کەسێ شتێك دەڵێ بەڵام دواتر نایکات یان پێچەوانەکەی دەکات، کەسی بەرامبەر بەشێوەی تەنزئامێز بەبیری دەهێنێتەوە.

| Hani erkenden gelecektin? | کوانێ لە زووەوە دەهاتی؟ |
|---|---|
| Hani bana yardım edecktiniz? | کوانێ یارمەتی منتان دەدا؟ |
| Hani bir daha yalan söylemeyecektin? | کوانێ جارێکی تر درۆت نەدەکرد؟ |

## ٦- شێوازی پێویستی چیرۆکی (Gereklilik Kipinin Hikayesi)

**لە حاڵەتی ئەری(Olumlu)دا کارێك شتێك لە ڕابردوودا پێویست بووە بکرێت و ببێت، بەڵام نەکراوەو نەبووە (دەبوو وابوایە). لە حاڵەتی نەرێش(Olumsuz)دا بەپێچەوانەوە**

**کارێك شتێك لە ڕابردوودا نەدەبوو بکرێت و ببێت بەڵام کراوەو بووە (نەدەبوو وابوایــە)، پاشگرەکەشی (mAlIydI-)یە.**

| ئەرێ<br>Olumlu | نەرێ<br>Olumsuz | پرسیاری ئەرێ<br>Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ<br>Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Bilmeliydim<br>دەبوو بمزانیبوایە | Bilmemeliydim<br>نەدەبوو بمزانیایە | Bilmeli miydim?<br>دەبوو بمزانیبوایە؟ | Bilmemeli miydim?<br>نەدەبوو بمزانیایە؟ |
| Bilmeliydin<br>دەبوو بتزانیبوایە | Bilmemeliydin<br>نەدەبوو بتزانیایە | Bilmeli miydin?<br>دەبوو بتزانیبوایە؟ | Bilmemeli miydin?<br>نەدەبوو بتزانیایە؟ |
| Bilmeliydi<br>دەبوو بیزانیبوایە | Bilmemeliydi<br>نەدەبوو بیزانیایە | Bilmeli miydi?<br>دەبوو بیزانیبوایە؟ | Bilmemeli miydi?<br>نەدەبوو بیزانیایە؟ |
| Bilmeliydik<br>دەبوو بمانزانیبوایە | Bilmemeliydik<br>نەدەبوو بمانزانیایە | Bilmeli miydik?<br>دەبوو بمانزانیبوایە؟ | Bilmemeli miydik?<br>نەدەبوو بمانزانیایە؟ |
| Bilmeliydiniz<br>دەبوو بتانزانیبوایە | Bilmemeliydiniz<br>نەدەبوو بتانزانیایە | Bilmeli miydiniz?<br>دەبوو بتانزانیبوایە؟ | Bilmemeli miydiniz?<br>نەدەبوو بتانزانیایە؟ |
| Bilmeliydiler<br>Bilmelilerdi<br>دەبوو بیانزانیبوایە | Bilmemeliydiler<br>Bilmemelilerdi<br>نەدەبوو بیانزانیایە | Bilmeli miydiler?<br>Bilmeliler miydi?<br>دەبوو بیانزانیبوایە؟ | Bilmemeli miydiler?<br>Bilmemeliler miydi?<br>نەدەبوو بیانزانیایە؟ |

تێبینی: لەکەسی سێیەمی کۆ (**Onlar**)دا دەتوانین جێناوی کەسی (lAr-) بە دوو شــێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

| Doktorun tavsiyelerine kulak ver**meliydi**n.<br>دەبووایە گوێ بدەیتە ڕاسپاردەکانی دکتۆر. |
|---|
| Söylediklerini dikkatle not et**meliydi**m.<br>دەبووایە بە وریایی قسەکانیم تێبینی کردبووایە. |
| İyileşmeden spor yap**mamalıydı**n.<br>پێش چاك بوونەوە نەدەبووایە وەرزش بکەیت. |
| Bu havada denize gir**memeliydi**n, su hala soğuk.<br>هێشتا ئاو ساردە، بەو هەوایە نەدەبوو بچنە ناو دەریا. |
| Bu kağıdı da imzala**malı mıydım**?<br>ئایا دەبووایە ئەو کاغەزەش ئیمزا بکەم؟ |
| Hesapları bir daha kontrol et**meli miydik**?<br>دەبووایە جارێکی تر ئەژمارەکان بپشکنینەوە؟ |
| Ona yardım et**memeli miydik** acaba?<br>ئاخۆ نەدەبوو یارمەتیمان بدابووایە؟ |

## ٧- شێوازی مەرجی چیرۆکی (Şart Kipinin Hikayesi):

پاشگرەکەی (**-sAydI**)یە، دوو ئەرکیشی هەیە لە ڕستەدا:

یەکەم- **مەرج و گریمانە دادەنێتە سەر کارێك لە ڕابردوودا، لەحاڵەتی ئەرێ(Olumlu) مانای (گەر وابووایە)، لە حاڵەتی نەرێشدا مانای (گەر وانەبووایە) دەدات**. لەو ئەرکەدا هەمیشە دوو ڕستە هەیە و فرمانی ڕستەی دووەم پێویستە بەشێوەی (کاتی بەرفراوانی چیرۆکی – Geniş Zamanın Hikayesi) بێت.

دووەم- **ویست و ئارەزوو یان پەشیمانی نیشان دەدات**. لەو ئەرکەدا یەك ڕستە بوونی هەیە و ئامرازی خۆزگە (**Keşke**) بەکاردەهێنرێت تێیدا.

| ئەرێ Olumlu | نەرێ Olumsuz | پرسیاری ئەرێ Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Yapsaydım بمکردایە | Yapmasaydım نەمکردایە | Yapsa mıydım? بمکردایە؟ | Yapmasa mıydım? نەمکردایە؟ |
| Yapsaydın بتکردایە | Yapmasaydın نەتکردایە | Yapsa mıydın? بتکردایە؟ | Yapmasa mıydın? نەتکردایە؟ |
| Yapsaydı بیکردایە | Yapmasaydı نەیکردایە | Yapsa mıydı? بیکردایە؟ | Yapmasa mıydı? نەیکردایە؟ |
| Yapsaydık بمانکردایە | Yapmasaydık نەمانکردایە | Yapsa mıydık? بمانکردایە؟ | Yapmasa mıydık? نەمانکردایە؟ |
| Yapsaydınız بتانکردایە | Yapmasaydınız نەتانکردایە | Yapsa mıydınız? بتانکردایە؟ | Yapmasa mıydınız? نەتانکردایە؟ |
| Yapsaydılar Yapsalardı بیانکردایە | Yapmasaydılar Yapmasalardı نەیانکردایە | Yapsa mıydılar? Yapsalar mıydı? بیانکردایە؟ | Yapmasa mıydılar? Yapmasalar mıydı? نەیانکردایە؟ |

تێبینی: لەکەسی سێیەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

| |
|---|
| Eğer dinle**seydi**n sana söylerdim.<br>ئەگەر گوێت بگرتایە بەتۆم دەگووت. |
| Param ol**saydı** sana değerli bir hediye alırdım.<br>پارەم هەبووایە دیاریەکی بەنرخم بۆ تۆ دەكڕی. |
| Keşke babamın hayatını biraz kolaylaştırabil**seydi**m.<br>خۆزگە بمتوانیبووایە ژیانی باوكم كەمێك ئاسان بكەم. |
| Türkiye'ye git**meseydi**m Türkçe öğrenmezdim.<br>نەچوومایەتە توركیا فێری توركی نەدەبووم. |
| Eğer bu yıl mezun ol**masaydı** üniversiteyi bırakırdı.<br>ئەگەر ئەو ساڵ دەرنەچووبووایە وازی لە زانكۆ دەهێنا. |
| Keşke o dosyayı gizlice oku**masaydı**m.<br>خۆزگە ئەو فایلەم بە نهێنی نەخوێندبایەوە. |
| Sence bu işi yap**sa mıydık** ?<br>بەڕای تۆ ئەو كارەمان بكردایە؟ |
| Neden kızdı! Git**mese miydik** acaba ?<br>بۆچی تووڕە بوو! ئاخۆ نەدەبوو بچووباین؟ |

## B- لێکدراوی ڕیوایەتی (Rivayet Birleşik Zamanlar/Kipler)

**پەیوەستە بە ڕابردووەوە، قسەکەر خۆی ڕووداوەکەی نەبینیووەو لەسەرچاوەیەکی ترەوە دەیزانێ.** بەهۆی تێکەڵکێشکردنی پاشگری (-mIş) لەگەڵ پاشگری زەمەن و شێوازەکانی تری زمانی تورکی دروست دەبێت، لەڕووی ڕێزمانەوانیشەوە یاساکانی هاوشێوەی (لێکدراوی چیرۆکی)ن.

| Fiil + Zaman/kip ekleri + -mIş + Şahıs eki. | Olumlu |
|---|---|
| Fiil + -mA + Zaman/kip ekleri + -mIş + Şahıs eki. | Olumsuz |
| Fiil + Zaman/kip ekleri + mI + (y) -mIş + Şahıs eki ? | Olumlu Soru |
| Fiil + mI + Zaman/kip ekleri + mI + (y) -mIş + Şahıs eki ? | Olumsuz Soru |

## ١- کاتی ئێستای ڕیوایەتی (Şimdiki Zamanın Rivayeti):

**بریتیە لە کارێك کە لە کاتی ئێستا ئەنجام دەدرێت بەڵام ئەو کەسەی باسی دەکات لە سەرچاوەیەکەوە زانیوویەتی، لەکاتی باس کردنیشی بۆ کەسانی تر بەو شێوەیە دەری دەبڕێت تا بزانن کە لە سەرچاوەیەکەوە زانیوویەتی و ڕاستەوخۆ نەیبینیووە، پاشگرەکەی دەبێتە (-yormuş)** و سێ ئەرکیشی هەیە لە ڕستەدا.

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
|---|---|---|
| Şimdiki Zaman<br>کاتی ئێستا | Şimdiki Zamanın Hikayesi<br>کاتی ئێستای چیرۆکی | Şimdiki Zamanın Rivayeti<br>کاتی ئێستای ڕیوایەتی |
| Maaş geli**yor**<br>مووچە دێت | Maaş geli**yordu**<br>مووچە دەهات | Maaş geli**yormuş**<br>(دەڵێن) مووچە دێت |

| ئەرێ<br>Olumlu | نەرێ<br>Olumsuz | پرسیاری ئەرێ<br>Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ<br>Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Kalıyormuşum<br>(دەڵێن)دەمێنمەوە | Kalmıyormuşum<br>(دەڵێن)نامێنمەوە | Kalıyor muymuşum?<br>(دەڵێن)دەمێنمەوە؟ | Kalmıyor muymuşum?<br>(دەڵێن)نامێنمەوە؟ |
| Kalıyormuşsun<br>(دەڵێن)دەمێنیتەوە | Kalmıyormuşsun<br>(دەڵێن)نامێنیتەوە | Kalıyor muymuşsun?<br>(دەڵێن)دەمێنیتەوە؟ | Kalmıyor muymuşsun?<br>(دەڵێن)نامێنیتەوە؟ |
| Kalıyormuş<br>دەمێنێتەوە | Kalmıyormuş<br>نامێنێتەوە | Kalıyor muymuş?<br>دەمێنێتەوە؟ | Kalmıyor muymuş?<br>نامێنێتەوە؟ |
| Kalıyormuşuz<br>دەمێنینەوە | Kalmıyormuşuz<br>نامێنینەوە | Kalıyor muymuşuz?<br>دەمێنینەوە؟ | Kalmıyor muymuşuz?<br>نامێنینەوە؟ |
| Kalıyormuş sunuz<br>دەمێننەوە | Kalmıyormuş sunuz<br>نامێننەوە | Kalıyor muymuşsunuz?<br>دەمێننەوە؟ | Kalmıyor muymuşsunuz?<br>نامێننەوە؟ |
| Kalıyormuşlar<br>Kalıyorlarmış<br>دەمێننەوە | Kalmıyormuşlar<br>Kalmıyorlarmış<br>نامێننەوە | Kalıyor muymuşlar?<br>Kalıyorlar muymuş?<br>دەمێننەوە؟ | Kalmıyor muymuşlar?<br>Kalmıyorlar muymuş?<br>نامێننەوە؟ |

تێبینی: لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

- لەکاتی وەرگێڕانی بۆ کوردی ئەگەر ووشەکانی وەك (وادیار بوو، بیستم کە، دەڵێن...هتد) لەپێشی دابنرێت ماناکەی باشتر دەدات چونکە قسەکەر خۆی نەیبینیووە.

ئەرکەکانی:

یەکەم/ کاتی ئێستای ڕیوایەتی(Şimdiki Zamanın Rivayeti) ئەوەیە کە **لە ئێستادا کارێك دەکرێت بەڵام ئەو کەسەی باسی دەکات خۆی نەیبینیووەو لەسەرچاوەیەکەوە زانیوویەتی.**

| Bildiğime göre Ali, Ayşe’yi çok sevi**yormuş**.<br>ئەوەندەی بزانم عەلی ئایشەی زۆر خۆش دەوێت. |
|---|
| İstanbul’da kar yağı**yormuş**.<br>(بیستم کە) لە ئیستەنبوڵ بەفر دەبارێت. |
| Aso her gün spor yapı**yormuş**.<br>(دەڵێن) ئاسۆ هەموو ڕۆژێك وەرزش دەکات. |
| Kardeşim ırmakta balık tutu**yormuş**.<br>(دەڵێن) براکەم لە ڕووبار ماسی دەگرێت. |
| Üniversiteyi kazanmak için çok çalışı**yormuş**.<br>(دەڵێن) بۆ بەدەستهێنانی زانکۆ زۆر دەخوێنێت. |

دووەم/ **بۆ خەیاڵ کردن**(Hayal kurma) **و وادانان**(Farz etme/Varsayma).

| Rüyamda sınav soruları görü**yormuş**um.<br>لە خەونمدا پرسیارەکانی تاقیکردنەوە دەبینم. |
|---|

| Şimdi İstanbul'da oku**yormuş**uz, neler yapardık neler! Arabaya atlı**yormuş**uz, saatlerce dolaşı**yormuş**uz… وای گەر ئێستا لە ئیستەنبوڵ دەمانخوێند، ئای چیمان دەکرد چی! هەڵمامدەدایە نێو ئۆتۆمبێل و بەسەعات دەسوڕاینەوە… |
| --- |
| Varsayalım ki şimdi para çeki**yormuş**uz, neler alı**yormuş**sun? با وای دابنێین کە ئێستا پارە ڕادەکێشین، چی دەکڕی؟ |

سێیەم/ **بۆ بەدرۆخستنەوەو بەڕاست نەزانینی قسەیەك** (Yalanlama)، زۆربەی کات بکەری ڕستەکە (Ben/Biz) دەبێت.

| ABD, Irak'a demokrasi götürü**yormuş**. ئەمەریکا دیموکراسی دەباتە عێراق. |
| --- |
| Güya ben aylık ١٥ bin Tl maaş alı**yormuş**um. گوایە من مانگانە ١٥ هەزار لیرە موچە وەردەگرم. |
| Ben gereksiz bir konuyu araştırı**yormuş**um. من لەبابەتێکی بێ سوود توێژینەوە دەکەم! |
| Sözüm ona iyileşmek için hiç gayret göster**miyormuş**um. گوایە بۆ چاك بوونەوە هیچ هەوڵێکم نەداوە. |

- بەکارهێنانی پاشگری **-mIş** بۆ بەدرۆخستنەوەو باوەڕ پێنەکردن لەنێو خەڵکدا زۆر باوە، کەسێك قسەیەکی ناماقوڵ دەکات یان قسەیەك کە بەدڵی بەرامبەرەکەی نیە، کەسی بەرامبەر لەبەر خۆیەوە وەك ناڕەزایی دەربڕینێك قسەکەی دەڵێتەوەو ئەو پاشگرە بەکاردێنێ، بۆ نمونە: کەسێکی ڕەزیل دەڵێ (من یارمەتی هەژاران دەدەم) (Ben fakirlere yardım ediyorum) بەرامبەرەکەشی وەك بە درۆزانینی قسەکەی لەبەر

خۆیـــەوە دەڵـــێ (یارمـــەتی هـــەژاران دەدات) (fakirlere yardım edi**yormuş**)، بەهەمان شێوە بۆ ڕستەی ناویش بەکاردێت بۆ نمونە کەسێکی دەوڵەمەنـدی ڕەزیـل دەڵـێ (مـن زۆر هـەژارم) (Ben çok fakirim) بەرامبەرەکـەی لەبـەر خۆیـەوە دەڵـێ (زۆر فەقیرە) (Çok fakir**miş**) واتە باوەڕ بە قسەکەی ناکات.

## ٢- کاتی بەرفراوانی ڕیوایەتی (Geniş Zamanın Rivayeti):

**بریتیە لەو کارەی کە لە ڕابردوودا ماوەیـەکی درێـژی خایانـدووەو پاشـان کۆتـایی پـێ هاتووە، بەڵام کەسی قسەکەر خۆی ئەم ڕووداوەی نـەبینیووە بـەڵکو لەسەرچـاوەیەکەوە زانیویـەتی (وەك مـرۆڤ، تیڤـی، ڕادیـۆ، ڕۆژنامە...هتـد). پاشگرەکەشـی (-rmIş/-ArmIş/-IrmIş/-mAzmIş)ە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
|---|---|---|
| Geniş Zamanın Rivayeti<br>کاتی بەرفراوانی ڕیوایەتی | Geniş Zamanın Hikayesi<br>کاتی بەرفراوانی چیرۆکی | Geniş Zaman<br>کاتی بەرفراوان |
| Maaş gel**irmiş**<br>(دەڵێن) مووچە دەهات | Maaş gel**irdi**<br>مووچە دەهات | Maaş gel**ir**<br>مووچە دێت |

| پرسیاری نەرێ<br>Olumsuz Soru | پرسیاری ئەرێ<br>Olumlu Soru | نەرێ<br>Olumsuz | ئەرێ<br>Olumlu |
|---|---|---|---|
| Almaz mıymışım? | Alır mıymışım? | Almazmışım<br>نەمدەکڕی | Alırmışım<br>دەمکڕی |

| | | دەمکڕی؟ | نەمدەکڕی؟ |
|---|---|---|---|
| Alırmışsın دەتکڕی | Almazmışsın نەتدەکڕی | Alır mıymışsın? دەتکڕی؟ | Almaz mıymışsın? نەتدەکڕی؟ |
| Alırmış دەیکڕی | Almazmış نەیدەکڕی | Alır mıymış? دەیکڕی؟ | Almaz mıymış? نەیدەکڕی؟ |
| Alırmışız دەمانکڕی | Almazmışız نەماندەکڕی | Alır mıymışız? دەمانکڕی؟ | Almaz mıymışız? نەماندەکڕی؟ |
| Alırmışsınız دەتانکڕی | Almazmışsınız نەتاندەکڕی | Alır mıymışsınız? دەتانکڕی؟ | Almaz mıymışsınız? نەتاندەکڕی؟ |
| Alırmışlar Alırlarmış دەیانکڕی | Almazmışlar Almazlarmış نەیاندەکڕی | Alır mıymışlar? Alırlar mıymış? دەیانکڕی؟ | Almaz mıymışlar? Almazlar mıymış? نەیاندەکڕی؟ |

تێبینی:

- لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

- بۆ ئەوەی جیای بکەینەوە لەکاتی بەرفراوانی چیرۆکی ( Geniş Zamanın Hikayesi) لەکاتی وەرگێڕانی بۆ کوردی ئەگەر ووشەکانی وەك (وادیار بوو، بیستم کە، دەڵێن...هتد) لەپێشی دابنرێت ماناکەی باشتر دەدات چونکە قسەکەر خۆی نەیبینیووە.

- بەگشتی ئەگەر بکەری ڕستەکە (**Ben/Biz**) بوو ئەوا مانای بـەدرۆ خسـتنەوەی ئـەو قسەیە (Yalanlama) دەدات.

| Duydum ki Türkler mantıyı çok sev**ermiş**.<br>بیستوومە کە تورکەکان زۆر حەزیان بە مانتی بوو. |
|---|
| Irmakta sen çok iyi yüz**ermiş**sin. Öyle mi?<br>تۆ لە ڕووباردا زۆر باش مەلەوانیت دەکرد، وایە؟ |
| Dediklerine göre bu adam hiç gül**mezmiş**.<br>بەگوێرەی قسان ئەو پیاوە هیچ پێنەدەکەنی. |
| O ülkede ölenler için yas tutul**mazmış**.<br>لەو وولاتەدا ماتەمینی بۆ مردووان نەدەگێڕدرا. |
| Kulaklarını hala iyi duy**ar mıymış**?<br>هێشتا گوێیەکانی باش دەیبیست؟ |
| Irak’ta mantı ye**r miymişsiniz**?<br>لە عێراق مانتتان دەخوارد؟ |
| Ben kimseyle kontak kura**maz mıymışım**?<br>من نەمدەتوانی لەگەڵ کەس پەیوەندی ببەستم؟ (بەدرۆ خستنەوە) |
| Biz annemizi hiç sev**mezmişiz**.<br>ئێمە دایکی خۆمان هیچ خۆش نەدەویست. (بەدرۆخستنەوە) |
| Ben sınavdan hep kopyayla geç**ermiş**im.<br>من لە تاقیکردنەوەکان هەر بە قۆپیە دەردەچووم. (بەدرۆخستنەوە) |
| Duygularını doğru dürüst dile getir**mez miymişsin**?<br>هەستەکانت بەڕاست و دروستی دەرنەدەبڕی؟ |

## ٣- ڕابـردووی بیسـتراوی ڕیوایـەتی ( Duyulan Geçmiş Zamanın Rivayeti)

**لێرەدا قسەکەر ڕووداوێك یان هەواڵێکی لەسەرچاوەیەکەوە (وەك مرۆڤ، تیڤـی، ڕادیـۆ، ڕۆژنامە...هتد) زانیوە، بەڵام بڕوا بەو هەواڵە یان ڕووداوە ناکـات و بەشـێوەی گومـان دەربـڕین(Şüphe etme) و گاڵتــە پــێ کردنــەوە(Dalga geçme, İroni) باسـی دەکات. پاشگرەکەشی (-mIşmIş)ە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
|---|---|---|
| Duyulan Geçmiş Zaman<br>کاتی ڕابردووی بیستراو | Duyulan Geçmiş Zamanın Hikayesi<br>ڕابردووی بیستراوی چیرۆکی | Duyulan Geçmiş Zamanın Rivayeti<br>ڕابردووی بیستراوی ڕیوایەتی |
| Maaş gel**miş**<br>مووچە هات | Maaş gel**mişti**<br>مووچە هاتبوو | Maaş gel**mişmiş**<br>(دەڵێن) مووچە هاتووە! |

| ئەرێ (Olumlu) | نەرێ (Olumsuz) | پرسیاری ئەرێ (Olumlu Soru) | پرسیاری نەرێ (Olumsuz Soru) |
|---|---|---|---|
| Gitmişmişim<br>(دەڵێن) چووم | Gitmemişmişim<br>(دەڵێن) نەچووم | Gitmiş miymişim?<br>(دەڵێن) چووم؟ | Gitmemiş miymişim?<br>(دەڵێن) نەچووم؟ |
| Gitmişmişsin<br>(دەڵێن) چوویت | Gitmemişmişsin<br>نەچوویت | Gitmiş miymişsin?<br>چوویت؟ | Gitmemiş miymişsin?<br>نەچوویت؟ |
| Gitmişmiş<br>(دەڵێن) چووە | Gitmemişmiş<br>نەچووە | Gitmiş miymiş? | Gitmemiş miymiş? |

| | | چووە؟ | نەچووە؟ |
|---|---|---|---|
| Gitmişmişiz<br>(دەڵێن) چووین | Gitmemişmişiz<br>نەچووین | Gitmiş miymişiz?<br>چووین؟ | Gitmemiş miymişiz?<br>نەچووین؟ |
| Gitmişmişsiniz<br>(دەڵێن) چوون | Gitmemişmişsiniz<br>نەچوون | Gitmiş miymişsiniz?<br>چوون؟ | Gitmemiş miymişsiniz?<br>نەچوون؟ |
| Gitmişmişler<br>Gitmişlermiş<br>(دەڵێن) چوون | Gitmemişmişler<br>Gitmemişlermiş<br>نەچوون | Gitmiş miymişler?<br>Gitmişler miymiş?<br>چوون؟ | Gitmemiş miymişler?<br>Gitmemişler miymiş?<br>نەچوون؟ |

تێبینی:

- لەکەسی سێەمی کۆ (**Onlar**) دا دەتوانین جێناوی کەسی (-lAr) بە دوو شێوە زیاد بکەین وەك لە لیستەکەدا هاتووە هیچ جیاوازیان نیە.

| |
|---|
| Ali sınavdan geçmemiş, halbüki günde ١٥ saat çalış**mışmış**.<br>عەلی لەتاقیکردنەوە دەرنەچوو، لەکاتێکا ڕۆژانە ١٥ کاتژمێر خوێندوویەتی.(گاڵتە) |
| Devletimiz daima bizleri destekle**mişmiş**.<br>دەوڵەتەکەمان هەمیشە پاڵپشتی ئێمەی کردووە. (گاڵتە) |
| Ben her gün bir kitab oku**muşmuş**um.<br>من هەموو ڕۆژێك کتێبێکم خوێندووەتەوە. (بەدرۆ خستنەوە) |
| Babası ona hiç para ver**memişmiş**.<br>باوکی هیچ پارەی بەو نەداوە. (بەدرۆخستنەوە) |
| Aso devlet için gönüllü çalış**mışmış**, hiç maaş al**mamışmış**.<br>ئاسۆ خۆبەخشانە بۆ دەوڵەت کاری کرد، هیچ مووچەی وەرنەگرت. (گاڵتە) |
| Ben ona izin ver**miş miymişim**? |

| من مۆڵەتەم بەوان داوە؟ (بەدرۆخستنەوە) |
| --- |
| Onun söylediklerine inan**mamış mıymışız**?<br>ئەی بڕوامان بە قسەکانی ئەو نەکرد؟ (گاڵتە) |
| Onlara yeterince ilgilen**memiş miymişiz**?<br>بەپێی پێویست بایەخمان بەوان نەدا؟ |

## ٤- کاتی داهاتووی ڕیوایەتی (Gelecek Zamanın Rivayeti)

**پلانێك، بڕیارێك یان کارێك کە لەداهاتوودا دەکرێت، کەسی قسەکەر ئەو شتەی لە سەرچاوەیەکی دیکەوە بیستووەو زانیوویەتی بۆیە بەو شێوازە دەری دەبڕێت. پاشگرەکەشی (-AcAkmIş)ە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
| --- | --- | --- |
| Gelecek Zaman<br>کاتی داهاتوو | Gelecek Zamanın Hikayesi<br>کاتی داهاتووی چیرۆکی | Gelecek Zamanın Rivayeti<br>کاتی داهاتووی ڕیوایەتی |
| Maaş gel**ecek**<br>مووچە دێت (لە داهاتوودا) | Maaş gel**ecekti**<br>مووچە دەهات (بەڵام...) | Maaş gel**ecekmiş**<br>(دەڵێن) مووچە دێت (لەداهاتوو) |

| ئەرێ (Olumlu) | نەرێ (Olumsuz) | پرسیاری ئەرێ (Olumlu Soru) | پرسیاری نەرێ (Olumsuz Soru) |
| --- | --- | --- | --- |

| Duracakmışım<br>(دەڵێن) دەوەستم | Durmayacakmışım<br>(دەڵێن) ناوەستم | Duracak mıymışım?<br>(دەڵێن) دەوەستم؟ | Durmayacak mıymışım?<br>(دەڵێن) ناوەستم؟ |
|---|---|---|---|
| Duracakmışsın<br>(دەڵێن) دەوەستیت | Durmayacakmışsın<br>(دەڵێن) ناوەستیت | Duracak mıymışsın?<br>دەوەستیت؟ | Durmayacak mıymışsın?<br>(دەڵێن) ناوەستیت؟ |
| Duracakmış<br>(دەڵێن) دەوەستێت | Durmayacakmış<br>(دەڵێن) ناوەستێت | Duracak mıymış?<br>دەوەستێت؟ | Durmayacak mıymış?<br>(دەڵێن) ناوەستێت؟ |
| Duracakmışız<br>(دەڵێن) دەوەستین | Durmayacakmışız<br>(دەڵێن) ناوەستین | Duracak mıymışız?<br>(دەڵێن) دەوەستین؟ | Durmayacak mıymışız?<br>(دەڵێن) ناوەستین؟ |
| Duracakmışsınız<br>(دەڵێن) دەوەستن | Durmayacakmışsınız<br>(دەڵێن) ناوەستن | Duracak mıymışsınız?<br>(دەڵێن) دەوەستن؟ | Durmayacak mıymışsınız?<br>(دەڵێن) ناوەستن؟ |
| Duracakmışlar<br>Duracaklarmış<br>(دەڵێن) دەوەستن | Durmayacakmışlar<br>Durmayacaklarmış<br>(دەڵێن) ناوەستن | Duracak mıymışlar?<br>Duracaklar mıymış?<br>(دەڵێن) دەوەستن؟ | Durmayacak mıymışlar?<br>Durmayacakl ar mıymış?<br>(دەڵێن) ناوەستن؟ |

| Bundan sonra bizlere samimi davran**acakmış**.<br>(دەڵێن) لێرە بەدواوە بە دڵسۆزی ڕەفتارمان لەگەڵ دەکات. |
|---|
| Bu gece, o kitabı bitir**ecekmiş**.<br>(دەڵێن) ئەو شەو ئەو کتێبە تەواو دەکات. |
| Duydum ki siz pikniğe gid**ecekmiş**siniz.<br>بیستم کە ئێوە دەچنە سەیران. |
| Bu yaz tatile çık**mayacakmış**lar.<br>ئەو هاوینە دەرناچن بۆ پشوو. |

| Sertifikamızı imzala**mayacakmış**.<br>(دەڵێن) بڕوانامەکەمان واژوو ناکات. |
| --- |
| Bahçeye çiçek dik**ecek miymişiz**?<br>گوڵ لە باخچەکە دەڕوێنین؟ |
| Otobüs mola ver**meycek miymiş**?<br>پاسەکە پشوو نادات؟ |
| Bize vakit ayır**mayacak mıymış**?<br>کات تەرخان ناکات بۆ ئێمە؟ |

## ٥- شـــێوازی پێویســـتی ڕیوایـــەتی ( Gereklilik Kipinin Rivayeti):

**کارێك لە (ڕابردوو) یان (ئێستا) یان (داهاتوو) پێویستە یان پێویست بووە بکرێت، بەڵام کەسی قسەکەر نەیزانیووەو دواتر بۆی دەرکەوتووە یان لـە سەرچـاوەیەکەوە زانیویـەتی. پاشگرەکەشی (-mallymIş) ە.**

| Dün bu faturayı öde**meliymiş**im.<br>دوێنێ دەبووایە ئەو فاتوورەم بدابووایە. (دواتر هەستی بە پێویستیەکە کردووە) |
| --- |
| Yarın bu faturayı öde**meliymiş**im.<br>بەیانی دەبێ ئەو فاتوورەیە بدەم. (لەسەرچاوەیەکی دیکەوە زانیوویەتی) |

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
|---|---|---|
| Gereklilik Kipi<br>شێوازی پێویستی | Gereklilik Kipinin Hikayesi<br>شێوازی پێویستی چیرۆکی | Gereklilik Kipinin Rivayeti<br>شێوازی پێویستی ڕیوایەتی |
| Maaş gel**meli**<br>دەبێ مووچە بێت | Maaş gel**meliydi**<br>دەبووایە مووچە بهاتبایە | Maaş gel**meliymiş**<br>(دەڵێن) دەبێ/دەبووایە مووچە بێت |

| ئەرێ<br>Olumlu | نەرێ<br>Olumsuz | پرسیاری ئەرێ<br>Olumlu Soru | پرسیاری نەرێ<br>Olumsuz Soru |
|---|---|---|---|
| Almalıymışım<br>دەبێ/دەبوو بکرم | Almamalıymışım<br>نابێ/نەدەبوو بکرم | Almalı mıymışım?<br>دەبێ/دەبوو بکرم؟ | Almamalı mıymışım?<br>نابێ/نەدەبوو بکرم؟ |
| Almalıymışsın<br>دەبێ/دەبوو بکریت | Almamalıymışsın<br>نابێ/نەدەبوو بکریت | Almalı mıymışsın?<br>دەبێ/دەبووبکریت؟ | Almamalı mıymışsın?<br>نابێ/نەدەبوو بکریت؟ |
| Almalıymış<br>دەبێ/دەبوو بکرێت | Almamalıymış<br>نابێ/نەدەبوو بکرێت | Almalı mıymış?<br>دەبێ/دەبووبکرێت؟ | Almamalı mıymış?<br>نابێ/نەدەبوو بکرێت؟ |
| Almalıymışız<br>دەبێ/دەبوو بکرین | Almamalıymışız<br>نابێ/نەدەبوو بکرین | Almalı mıymışız?<br>دەبێ/دەبوو بکرین؟ | Almamalı mıymışız?<br>نابێ/نەدەبوو بکرین؟ |
| Almalıymışsınız<br>دەبێ/دەبوو بکرن | Almamalıymışsın ız | Almalı mıymışsınız? | Almamalı mıymışsınız? |

| | نابێ/نەدەبوو بکرێن | دەبێ/دەبوو بکرێن؟ | نابێ/نەدەبوو بکرێن؟ |
|---|---|---|---|
| Almalıymışlar<br>Almalılarmış<br>دەبێ/دەبوو بکرێن | Almamalıymışlar<br>Almamalılarmış<br>نابێ/نەدەبوو بکرێن | Almalı mıymışlar?<br>Almalılar mıymış?<br>دەبێ/دەبوو بکرێن؟ | Almamalı mıymışlar?<br>Almamalılar mıymış?<br>نابێ/نەدەبوو بکرێن؟ |

| Perdeleri aç**malıymış**.<br>دەبێ/دەبوو پەردەکان بکاتەوە. |
|---|
| Her gün yarım saat koş**malıymış**ım.<br>هەموو ڕۆژێك دەبێ نیو کاتژمێر ڕابکەم. |
| Yarın parka git**memeliymiş**im.<br>دەبێ بەیانی نەچمە پارك. |
| Bu kadar fazla tuz kullan**mamalıymış**ız.<br>دەبێ/دەبوو ئەوەندە خوێی زیاد بەکارنەهێنین. |
| Bu metni çevir**meli miymişiz**?<br>دەبێ/دەبوو ئەو تێکستە وەربگێڕین؟ |
| Bu sahada maç yap**mamalı mıymışız**?<br>دەبێ/دەبوو لەو گۆڕەپانە یاری نەکەین؟ |
| Bu yoldan sap**mamalı mıymış**?<br>دەبێ/دەبوو لەو ڕێگایە لانەدات؟ |

## ٦- شێوازی مەرجی ڕیوایەتی (Şart Kipinin Rivayeti)

**ڕوودان و ڕوونەدانی کارێك لە ڕابردوودا بەمەرجێك دەبەستێتەوە، کەسی قسەکەر ئەمەی لەسەرچاوەیەکی تر زانیووە یان دواتر هەستی پێ کردووە. پاشگرەکەی (-sAymIş) ە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
|---|---|---|
| Şart Kipinin Rivayeti<br>شێوازی مەرجی ڕیوایەتی | Şart Kipinin Hikayesi<br>شێوازی مەرجی چیرۆکی | Şart Kipi<br>شێوازی مەرجی |
| Maaş gel**seymiş**<br>(دەڵێن) مووچە هاتبووایە | Maaş gel**seydi**<br>مووچە هاتبووایە | Maaş gel**se**<br>مووچە بێت |

| پرسیاری نەرێ<br>Olumsuz Soru | پرسیاری ئەرێ<br>Olumlu Soru | نەرێ<br>(Olumsuz) | ئەرێ<br>(Olumlu) |
|---|---|---|---|
| Yazmasa mıymışım?<br>نەمنووسیبوایە؟ | Yazsa mıymışım?<br>بمنووسیبوایە؟ | Yazmasaymışım<br>نەمنووسیبوایە | Yazsaymışım<br>بمنووسیبوایە |
| Yazmasa mıymışsın?<br>نەتنووسیبوایە؟ | Yazsa mıymışsın?<br>بتنووسیبوایە؟ | Yazmasaymışsın<br>نەتنووسیبوایە | Yazsaymışsın<br>بتنووسیبوایە |
| Yazmasa mıymış?<br>نەینووسیبوایە؟ | Yazsa mıymış?<br>بینووسیبوایە؟ | Yazmasaymış<br>نەینووسیبوایە | Yazsaymış<br>بینووسیبوایە |
| Yazmasa mıymışız? | Yazsa mıymışız? | Yazmasaymışız<br>نەمانووسیبوایە | Yazsaymışız<br>بمانووسیبوایە |

| | | بمانووسیبوایە؟ | نەمانووسیبوایە؟ |
|---|---|---|---|
| Yazsaymışsın ız<br>بتانووسیبوایە | Yazmasaymışsın ız<br>نەتانووسیبوایە | Yazsa mıymışsınız?<br>بتانووسیبوایە؟ | Yazmasa mıymışsınız?<br>نەتانووسیبوایە؟ |
| Yazsaymışlar<br>Yazsalarmış<br>بیاننووسیبوایە | Yazmasaymışlar<br>Yazmasalarmış<br>نەیاننووسیبوایە | Yazsa mıymışlar?<br>Yazsalar mıymış?<br>بیاننووسیبوایە؟ | Yazmasa mıymışlar?<br>Yazmasalar mıymış?<br>نەیاننووسیبوایە؟ |

تێبینی: ئەگەر لەڕستەدا (Keşke) بەکارهات ئەوا یەك ڕستە دەبێت، بەلاَم بەبێ هەبوونی (Keşke) پێویستە دوو ڕستە هەبێت تا ماناکەی تەواوبێت.

| |
|---|
| Biraz sabırlı ol**saymış**ım bunu daha ucuz alırmışım.<br>کەمێك ئارامگر بوومایە ئەوەم هەرزانتر دەکڕی. |
| Keşke onlara bir teşekkür et**seymiş**iz.<br>خۆزگە سوپاسێکی ئەوانمان کردبووایە. |
| Keşke onunla hiç arkadaşlık et**meseymiş**im.<br>خۆزگە لەگەلْ ئەودا هیچ هاوڕێیەتیم نەکردبووایە. |
| Hayallerinizden keşke vazgeç**meseymiş**siniz.<br>خۆگە وازتان لە خەیالّەکانتان نەهێنابووایە. |
| Orada bir kahve iç**se miymişiz**?<br>لەوێ قاوەیەکمان بخواردبایەوە؟ |
| Kutlama mesajı gönder**mese miymişim**?<br>نامەی پیرۆزباییم نەناردبووایە؟ |

## C- لێکدراوی مەرجی (Şart Birleşik Zamanlar/Kipler):

لەبەشەکانی پێشوودا شێوازی مەرجی بەو شێوەیە خوێنرا (**Fiil+-sA**) واتە بەشێوە سادەکەی کە فرمان و پاشگری مەرجی ڕاستەوخۆ بەیەکەوە لکابوون، بەڵام **ئەم شێوازە سادەیە کەم بەکار دێت و بۆ کارێکی کورت و کاتی و دەم و دەست بەکاردێت**. هەرچی شێوازی بەربڵاوی بەکارهێنانی ڕستەی مەرجیە بریتیە لەشێوە لێکدراوەکەی کە لەو بەشەدا بە ووردی ڕوون دەکرێتەوە.

**تێبینی: بەگشتی لە سەرجەم بابەتەکانی (کات و شێوازی لێکدراو)دا حاڵەتی (پرسیاری ئەرێ و پرسیاری نەرێ) زۆرکەم بەکار دەهێنرێ، زیاتر حاڵەتەکانی (ئەرێ و نەرێ) بەکاردەهێنرێ، بەتایبەتتر لەو لقەدا.**

| Fiil + Zaman/kip ekleri + -sA + Şahıs eki | Olumlu |
|---|---|
| Fiil + -mA + Zaman/kip ekleri + -sA + Şahıs eki | Olumsuz |

### ١- کاتی ئێستای مەرجی (Şimdiki Zamanın Şartı)

**ئەم شێوە لێکدراوە کەم بەکاردەهێنرێت لە نێوان قسەکەرانی زمانی تورکیدا. پاشگرەکەی (-yorsa)ەو مەرج دەخاتە سەر فرمان لەکاتی ئێستادا.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | | |
|---|---|---|---|
| Şimdiki Zaman<br>کاتی ئێستا | Şimdiki Zamanın Hikayesi/ Rivayeti<br>کاتی ئێستای چیرۆکی/ ڕیوایەتی | | Şimdiki Zamanın Şartı<br>کاتی ئێستای مەرجی |
| Maaş geli**yor** | Maaş geli**yordu** | Maaş geli**yormuş** | Maaş geli**yorsa** |

| مووچە دێت | مووچە دەهات | (دەڵێن)مووچەدێت | (ئەگەر ئێستا) مووچە بێت |
|---|---|---|---|

| ئەرێ (Olumlu) | نەرێ (Olumsuz) |
|---|---|
| Satıyorsam<br>(گەر) بفرۆشم | Satmıyorsam<br>(گەر) نەفرۆشم |
| Satıyorsan<br>(گەر) بفرۆشیت | Satmıyorsan<br>(گەر) نەفرۆشیت |
| Satıyorsa<br>(گەر) بفرۆشێت | Satmıyorsa<br>(گەر) نەفرۆشێت |
| Satıyorsak<br>(گەر) بفرۆشین | Satmıyorsak<br>(گەر) نەفرۆشین |
| Satıyorsanız<br>(گەر) بفرۆشن | Satmıyorsanız<br>(گەر) نەفرۆشن |
| Satıyorsalar<br>Satıyorlarsa<br>(گەر) بفرۆشن | Satmıyorsalar<br>Satmıyorlarsa<br>(گەر) نەفرۆشن |

| Tercüme yapabili**yorsa**n bunu da çevir!<br>گەر دەتوانی تەرجەمە بکەیت ئەوەش وەربگێڕە. |
|---|
| Çalış**yorsa**n gelmeyeyim.<br>ئەگەر کار دەکەیت با نەیەم. |
| Yemek yemi**yorsa**n lütfen sofradan kalk!<br>ئەگەر نان ناخۆیت تکایە لەسەر خوان هەڵسە. |
| Bana güven**miyorsa**n çok üzüleceğim. |

گەر متمانە بەمن نەکەیت زۆر دڵتەنگ دەبم.

## ٢- کاتی بەرفراوانی مەرجی (Geniş Zamanın Şartı)

**بە گرنگترین بابەت و بڕبڕەی پشتی شێوازی مەرجی دادەنرێت و زۆرتـرین بـەکارهێنانی هەیە لە نێوان قسەکەرانی زمانی تورکیدا، بەشێوەیەك کە قسەکەری تورك بۆ کاتەکانی ئێستا و بەرفراوان و داهاتووی مەرجی هەر ئەم شێوەیە بەکاردەهێنێت. پاشگرەکەی (-rsA/-ArsA/-IrsA/-mAzsA) یە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | |
|---|---|---|
| Geniş Zamanın Şartı<br>کاتی بەرفراوانی مەرجی | Geniş Zamanın Hikayesi/ Rivayeti<br>کاتی بەرفراوانی چیرۆکی/ ڕیوایەتی | Geniş Zaman<br>کاتی بەرفراوان |
| Maaş gel**irse**<br>(ئەگەر) مووچە بێت | Maaş gel**irdi** / gel**irmiş**<br>مووچە دەهات | Maaş gel**ir**<br>مووچە دێت |

| **نەرێ (Olumsuz)** | **ئەرێ (Olumlu)** |
|---|---|
| Göndermezsem<br>(گەر) نەنێرم | Gönderirsem<br>(گەر) بنێرم |
| Göndermezsen<br>(گەر) نەنێریت | Gönderirsen<br>(گەر) بنێریت |
| Göndermezse<br>(گەر) نەنێرێت | Gönderirse<br>(گەر) بنێرێت |
| Göndermezsek<br>(گەر) نەنێرین | Gönderirsek<br>(گەر) بنێرین |
| Göndermezseniz | Gönderirseniz |

| (گەر) بنێرن | (گەر) نەنێرن |
| --- | --- |
| Gönderirseler<br>Gönderirlerse<br>(گەر) بنێرن | Göndermezseler<br>Göndermezlerse<br>(گەر) نەنێرن |

| Onunla evlenmek ist**erse**n çok para harcamalısın.<br>گەر بتەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو بکەیت دەبێ پارەی زۆر خەرج بکەیت. |
| --- |
| Zeynep gel**mezse** bu iş bitmez.<br>زەینەب نەیەت ئەو کارە تەواو نابێت. |
| Enflasyon yüksel**irse** maddi durumumuz kötüleşecek.<br>هەڵاوسان بەرزبێتەوە دۆخی ماددیمان خراپ دەبێت. |
| Bence az yemek ye**rse**n, spor yap**arsa**n zayıflarsın.<br>بەڕای من نان کەم بخۆیت، وەرزش بکەیت لاواز دەبیت. |
| Çocuklar bol bol süt iç**erse** uzun boylu olur.<br>منداڵان زۆر شیر بخۆنەوە باڵا بەرز دەردەچن. |
| Gece yeterince uyu**mazsa**k gündüz gergin oluruz.<br>شەو بەپێی پێویست نەخەوین بەڕۆژ گرژومۆن دەبین. |
| Yeni şartlar ileri sür**mezse**niz sizinle çalışabiliriz. |

| گەر مەرجی نوێ نەهێننە پێشەوە دەتوانین لەگەڵتان کار بکەین. |
|---|

- لەو شێوازەدا دەتوانرێ مانای **گوێ پێ نەدان**(Umarsamama) و **فەرامۆش کردن**(Aldırmama) دروست بکرێت.

| Uf ya! Gel**mezse**n gelme, evde kal!<br>ئۆف! نایەی مەیە لەماڵ بمێنەوە. |
|---|
| Bana ne, gid**erse**n git be!<br>بەمن چی، دەڕۆیت دە بڕۆ. |
| Benim umrumda değil, ilacını iç**mezse**n içme!<br>بۆم گرنگ نیە، عیلاجەکانت ناخۆی مەخۆ. |
| Hesabı öde**mezse**n ödeme, ben öderim.<br>گەر حیسابەکە نادەیت مەیدە من دەیدەم. |

تێبینی: گەر تەرجەمەی ووشەیی بۆ ئەو ڕستانەی سەرەوە بکەی لە کوردیەکەی مانای دەشێوێت، چونکە دەبێتە (نەیەی مەیە، بڕۆیت بڕۆ، نەخۆیت مەخۆ...هتد) بەلاّم ئیتر هەر زمانەو لۆژیکی تایبەتی خۆی هەیەو لە زمانی تورکی بەو شێوەیە بەکاری دێنن.

### ٣- ڕابردووی بینراوی مەرجی(Görülen Geçmiş Zamanın Şartı)

**بەکارهێنانێکی گرنگە و بە مانای (کردبێت، چوویێت، هاتبێت...) دێت. پاشگرەکەشی (DIysA-) یە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) |
|---|

| Görülen Geçmiş Zaman<br>ڕابردووی بینراو | Şart Kipinin Hikayesi/ Rivayeti<br>شێوازی مەرجی چیرۆکی/ ڕیوایەتی | Görülen Geçmiş Zamanın Şartı<br>ڕابردووی بینراوی مەرجی |
|---|---|---|
| Maaş gel**di**<br>مووچە هات | Maaş gel**seydi**/gel**seymiş**<br>مووچە هاتبووایە | Maaş gel**diyse**<br>(ئەگەر) مووچە هاتبێت |

| ئەرێ<br>(Olumlu) | نەرێ<br>(Olumsuz) |
|---|---|
| Gördüysem<br>بینیبێتم | Görmediysem<br>نەمبینیبێت |
| Gördüysen<br>بینیبێتت | Görmediysen<br>نەتبینیبێت |
| Gördüyse<br>بینیبێتی | Görmediyse<br>نەیبینیبێت |
| Gördüysek<br>بینیبێتمان | Görmediysek<br>نەمانبینیبێت |
| Gördüyseniz<br>بینیبێتتان | Görmediyseniz<br>نەتانبینیبێت |
| Gördüyseler<br>Gördülerse<br>بینیبێتیان | Görmediyseler<br>Görmedilerse<br>نەیانبینیبێت |

| Sizi rahatsız et**tiyse**m özür dilerim.<br>گەر ئێوەم نارەحەت کردبێت داوای لێبوردن دەکەم. |
|---|
| Vakti gel**diyse** haydi yola çıkalım.<br>کاتی هاتبێت یەڵا با وەڕێ کەوین. |
| Parayı öde**mediyse**n ben öderim. |

| پارەکەت نەدابێت من دەیدەم. |
|---|
| Çay iç**mediyse**niz hemen çay demleyeyim.<br>چاتان نەخواردبێتەوە با یەکسەر چای لێ بنێم. |
| Eğer dinlen**mediyse** biraz daha uyusun!<br>ئەگەر نەحەسابێتەوە با کەمێکی تریش بخەوێت. |

٤- ڕابردووی بیستراوی مەرجی (Duyulan Geçmiş Zamanın Şartı)

**لێرەدا کەسی قسەکەر بوون و نەبوون و کران و نەکرانی کارەکە لەسەرچاوەیەکەوە دەزانێت. پاشگرەکەی (-mIşsA)یە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) |
|---|

| Duyulan Geçmiş Zaman<br>ڕابردووی بیستراو | Duyulan Geçmiş Zamanın Hikayesi/ Rivayeti<br>ڕابردووی بیستراوی چیرۆکی/ ڕیوایەتی | | Duyulan Geçmiş Zamanın Şartı<br>ڕابردووی بیستراوی مەرجی |
|---|---|---|---|
| Maaş gel**miş**<br>مووچە هات | Maaş gel**mişti**<br>مووچە هاتبوو | Maaş gel**mişmiş**<br>(دەڵێن) مووچە هات | Maaş gel**mişse**<br>(دەڵێن ئەگەر)<br>مووچە هاتبێت |

| **(Olumlu) ئەری** | **(Olumsuz) نەری** |
|---|---|
| Uyumuşsam | Uyumamışsam |
| خەوتبێتم | نەخەوتبێتم |
| Uyumuşsan | Uyumamışsan |
| خەوتبێت | نەخەوتبێت |
| Uyumuşsak | Uyumamışsak |
| خەوتبێتین | نەخەوتبێتین |
| Uyumuşsalar | Uyumamışsalar |
| Uyumuşlarsa<br>خەوتبێتن | Uyumamışlarsa<br>نەخەوتبێتن |

| |
|---|
| Kardeşin uyu**muşsa** Tv'yi kapat!<br>گەر براکەت خەوتبێت تیڤیەکە بکوژێنەوە. |
| Ali evine ulaş**mışsa** annesi ne mutludur.<br>گەر عەلی گەیشتبێتەماڵەوە دایکی چەندە دڵخۆشە. |
| Çocukların tümü aşılan**mamışsa** büyük problem olacak.<br>هەموو منداڵەکان نەکوترابن کێشەیەکی گەورە دروست دەبێت. |
| Runa kayseri'ye gel**mişse** mutlaka beni arar.<br>گەر ڕوونە هاتبێتە قەیسەری حەتمەن پەیوەندیم پێوە دەکات. |
| Kardeşim spor yap**mamışsa** mutlaka kilo alır.<br>براکەم وەرزشی نەکردبێت بەدڵنیاییەوە قەڵەو دەبێت. |

## ٥- کاتی داهاتووی مەرجی (Gelecek Zamanın Şartı)

**بۆ مەرج خستنە سەر کارێکی داهاتوو بەکاردێت، بەڵام لەنێوان قسەکەرانی تورکیدا ئەم شێوازە کەم بەکاردەهێنرێت و لەجیاتی ئەوە (کاتی بەرفراوانی مەرجی) بەکاردەهێنرێت، پاشگرەکەشی (AcAksA-)یە.**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | | |
|---|---|---|---|
| Gelecek Zamanın Şartı<br>کاتی داهاتووی مەرجی | Gelecek Zamanın Hikayesi/ Rivayeti<br>کاتی داهاتووی چیرۆکی/ ڕیوایەتی | | Gelecek Zaman<br>کاتی داهاتوو |
| Maaş gel**ecekse**<br>(ئەگەر لەداهاتوو) مووچە بێت | Maaş gel**ecekmiş**<br>(دەڵێن) مووچە دێت | Maaş gel**ecekti**<br>مووچە دەهات (بەڵام...) | Maaş gel**ecek**<br>مووچە دێت |

| نەرێ **(Olumsuz)** | ئەرێ **(Olumlu)** |
|---|---|
| Yapmayacaksam<br>(گەر) نەکەم | Yapacaksam<br>(گەر) بکەم |
| Yapmayacaksan<br>(گەر) نەکەیت | Yapacaksan<br>(گەر) بکەیت |
| Yapmayacaksa<br>(گەر) نەکات | Yapacaksa<br>(گەر) بکات |
| Yapmayacaksak<br>(گەر) نەکەین | Yapacaksak<br>(گەر) بکەین |
| Yapmayacaksanız<br>(گەر) نەکەن | Yapacaksanız<br>(گەر) بکەن |
| Yapmayacaksalar<br>Yapmayacaklarsa<br>(گەر) نەکەن | Yapacaksalar<br>Yapacaklarsa<br>(گەر) بکەن |

| Öğretmen ol**acaksa**n daha sabırlı olmalısın.<br>(گەر لەداهاتوو) ببیتە مامۆستا پێویستە لەسەرخۆتر بیت. |
|---|
| Yemek yiy**ecekse**n sana da servis açayım!<br>(گەر) نان بخۆیت با بۆتۆش سەرڤیس بکەمەوە. |
| O cipsi ye**meyecekse**n ben memnuniyetle yerim.<br>(گەر) ئەو جیپسە نەخۆیت من بە خۆشحاڵیەوە دەیخۆم. |
| Beni dinle**meyecekse**niz hiç konuşmaya başlamayayım.<br>(گەر) گوێ لەمن نەگرن با هیچ دەست بەقسەکردن نەکەم. |

## ٦- شێوازی پێویستی مەرجی (Gereklilik Kipinin Şartı)

**لێرەدا پێویست بوون و نەبوونی کارێك مەرجدار دەكات. پاشگرەكەشی (-mAlıysA).**

| بەراوردکاری (Karşılaştırma) | | | |
|---|---|---|---|
| Gereklilik Kipi<br>شێوازی پێویستی | Gereklilik Kipinin Hikayesi/ Rivayeti<br>شێوازی پێویستی چیرۆکی/ ڕیوایەتی | | Gereklilik Kipinin Şartı<br>شێوازی پێویستی مەرجی |
| Maaş gel**meli**<br>دەبێ مووچە بێت | Maaş gel**meliydi**<br>دەبووایە مووچە هاتبووایە | Maaş gel**meliymiş**<br>دەبێ/دەبوو مووچە بێت | Maaş gel**meliyse**<br>(گەر) پێویست بکات مووچە بێت |

| ئەرێ (Olumlu) | نەرێ (Olumsuz) |
|---|---|
| Yapmalıysam<br>(گەر) دەبێ بکەم | Yapmamalıysam<br>(گەر) نابێ بکەم |
| Yapmalıysan | Yapmamalıysan |

| (گەر) دەبێ بکەیت | (گەر) نابێ بکەیت |
|---|---|
| Yapmalıysa<br>(گەر) دەبێ بکات | Yapmamalıysa<br>(گەر) نابێ بکات |
| Yapmalıysak<br>(گەر) دەبێ بکەین | Yapmamalıysak<br>(گەر) نابێ بکەین |
| Yapmalıysanız<br>(گەر) دەبێ بکەن | Yapmamalıysanız<br>(گەر) نابێ بکەن |
| Yapmalıysalar<br>Yapmalılarsa<br>(گەر) دەبێ بکەن | Yapmamalıysalar<br>Yapmamalılarsa<br>(گەر) نابێ بکەن |

| Ben de gel**meliyse**m geliyorum.<br>گەر پێویست بکات منیش بێم دێم. |
|---|
| Ülkene git**meliyse**n hemen git.<br>گەر پێویست بکات بچیتە وولاتەکەت یەکسەر بڕۆ. |
| Kilo al**mamlıysa**n bence böyle yağlı şeyler yememelisin.<br>گەر نابێت قەڵەوبیت بەمن خواردنی ئاوا چەور نابێ بخۆیت. |
| İstanbul'a git**memeliyse**n biletini iptal ettir.<br>گەر نابێت بچیتە ئیستەنبوڵ بلیتەکەت هەڵوەشێنەوە. |

تێبینی: لەو شێوازەدا مانای **ناچاری**(Mecburiyet) و **بێ بەدیلی**(Seçeneksiz) دەردەکەوێت. (لەپێشوودا لە بابەتی mAktaAn başka- دا هەمان ناچاریی و بی بەدیلی هەبوو).

| Senin için öl**meliyse**m, ölürüm.<br>گەر پێویست بکات بۆ تۆ بمرم، دەمرم. |
|---|
| Bu faturayı öde**meliyse**n, öde!<br>گەر پێویست بکات ئەو فاتورەیە بدەیت، بیدە. |

| Ameliyat ol**malıysa**m, olurum. |
| --- |
| گەر دەبێ عەمەلیالت بکرێم، دەیکەم. |
| Konuyu bir daha anlat**malıysa**m, anlatırım. |
| گەر دەبێ دووبارە بابەتەکە باس بکەم، باس دەکەم. |

- دوو تێبینی گرنگ:

١- لەنووسینی ئەکادیمیدا شێوازی (**Fiil+-mIş+-DIr**) زۆر بەکاردەهێنرێت کە بەمانای ڕابردووی تەواو دێت لە زمانی کوردیدا.

| Gel**di** | Gel**miş** | Gel**miştir** |
| --- | --- | --- |
| هات | (دەڵێن) هات | هاتووە |
| Yaz**mışımdır** | Kork**muştur** | Öden**miştir** |
| نووسیومە | ترساوە | (پارەکە) دراوە |
| Bit**miştir** | Yapıl**mıştır** | Kaydedil**memiştir** |
| تەواوبووە | ئەنجام دراوە | تۆمارنەکراوە |

| M.Ö. ٣.٠٠٠ yılı civarında Irak’ta çiviyazısı bulun**muştur**. |
| --- |
| لەدەوری ٣٠٠٠ پ.ز نووسینی بزماری لە عێراق دۆزراوەتەوە. |
| Büyük devletler arasında çatışma meydanı ol**muştur**. |
| بووەتە مەیدانی پێکدادان لەنێوان دەوڵەتە گەورەکاندا. |

٢- بەهەمان شێوە لە نووسیندا شێوازی (**-ol + -mış**) لە زۆر شوێندا بەرچاو دەکەوێت. بۆ نمونە:

| ABD’ye gitme hayali bit**miş ol**du.<br>خەیاڵی چوونە ئەمەریکای بە کۆتا هات. |
|---|
| Kürtler, Safeviler’den usan**mış ol**dular.<br>کوردەکان لە سەفەویەکان بێزار بوون. |
| Irak iktidarından uzaklaştırıl**mış ol**dular.<br>لە دەسەڵاتی عێراق دوورخرانەوە. |

- بونیادی فرمانەکان (Fiillerde Çatı)

یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی ڕێزمانی تورکی، لەڕێگای ئەم کرداره ڕێزمانیەوە دەتوانرێ شێوەی جیا جیا لە ڕەگی فرمانەکان دروست بکرێ بۆ نمونە (کردن، کران، پێ کردن، پێکڤەکردن...هتد). بەر لە باس کردنی لق و پۆپەکانی ئەم بابەتە بە کورتی هەردوو چەمکی (Özne) و (Yüklem) دەناسێنین، چونکە بۆ تێگەیشتن لەو بابەتە پێویستە.

لە ڕێزمانی کوردیدا ڕەگەزی سەرەکی ڕستە بەپێی ڕستەی فرمانی و ڕستەی ناویی جیاوازە، لەڕستەی فرمانیدا (**بکەر و کار و بەرکار**) هەیە، بەڵام لە ڕستەی ناوییدا (**نیهاد و گوزارە و تەواوکەر**) هەیە.

| ڕ. فرمانی | ئاسۆ نان دەخوات. | ئاسۆ: بکەرە | نان: بەرکارە | دەخوات: کارە |
|---|---|---|---|---|
| ڕ. ناوی | ئاسۆ کوڕێکی لاوازە. | ئاسۆ: نیهادە | کوڕێك: تەواوکەرە | لاواز: گوزارەیە |

**بەڵام لە ڕێزمانی تورکیدا ئەو جیاوازیە بــوونی نیــە، بــە (بکــەر و نیهــاد) دەگــووترێ (Özne) و بە (کار و گوزارە)ش دەگووترێ (Yüklem).**

| Fiil Cü. | Ali okula gidiyor. | Ali : özne | gidiyor : yüklem |
|---|---|---|---|
| İsim Cü. | Ali şişmandır . | Ali : özne | şişman : yüklem |

بابەتی بونیادی فرمانەکان (**Fiillerde Çatı**) دەبێتە پێنج لقی سەرەکی:

| Etken Fiil (Aktif) | فرمانی کارا | Gör- | بینین |
|---|---|---|---|
| Edilgen Fiil | فرمانی بکەر نادیار | Görül- | بینران |
| Dönüşlü Fiil | فرمانی خۆسەریی | Görün- | بینران(دەرکەوتن) |
| İşteş Fiil | فرمانی هاوبەش | Görüş- | یەکتر بینین |
| Ettirgen Fiil | فرمانی پێ کردن | Gördür- | پێ بینین |

## A- فرمانی کارا (Etken Fiil)

| Gel- | هاتن | Gönder- | ناردن | Yat- | پاڵدانەوە |
|---|---|---|---|---|---|

| Git- | چوون | Barış- | ئاشت بوونەوە | Çek- | ڕاکێشان |
|---|---|---|---|---|---|
| Oku- | خوێندنەوە | Tut- | گرتن | İt- | پاڵدان |
| Yaz- | نووسین | Kal- | مانەوە | Seyrte- | سەیرکردن |

**بریتیە لە ڕەگی سادەی فرمان، فرمانێکی کارایە واتە بکەر(Özne)ی هەیە** جا بکەرەکە دیار(Gerçek Özne) بێت یان شاراوە(Gizli Özne) بێت و ئەو فرمانە دەتوانێ بکەرەکە دیاری بکات.

| |
|---|
| Ben Türkiye’den geliyorum.<br>**Ben**: gerçek özne<br>**geliyorum**: yüklem/etken F. |
| Sen babamla çalışmalısın.<br>**Sen**: gerçek özne<br>**Çalışmalısın**: yüklem/etken |
| Her sabah erken çıkıyor.<br>**O**: gizli özne<br>**Çıkıyor**: yüklem/etken F. |
| Sokaklarda çok fakir görürüz.<br>**Biz**: gizli özne<br>**Görürüz**: yüklem/etken F. |
| Siz hastalara yardım edin.<br>**Siz**: gerçek özne<br>**yardım edin**: yüklem/etken F. |
| Öyle değil, yanlış anladılar.<br>**Onlar**: gizli özne<br>**Anladılar**: yüklem/etken F. |

تێبینی: لەڕێگای جێناوە کەسیەکانی سەر (Yüklem) دەتوانین بکەرە (**Özne**) شاراوەکان( **Gizli** بدۆزینەوە، بۆ نمونە لە (görür**üz**)دا (**üz**) دەگەڕێتەوە بۆ (**Biz**)، لە (anladı**lar**)دا (**lar**) دەگەڕێتەوە بۆ (**onlar**).

## B- فرمانی بکەر نادیار (Edilgen Fiil)

**لێرەدا بکەری فرمانەکە نادیارە و نازانرێ کێ کردوویەتی، لەم جۆرە ڕستانەدا بکەرەکە زۆر گرنگ نیە بەڵکو ئەو کارەی کە کراوە گرنگترە بۆیە ئاماژە بە بکەرەکە نادرێت و دەبێتە بکەر نادیار.** ئەم شێوە فرمانانە لە نووسین و ئاخاوتنی ئەکادیمی و فەرمیدا بایەخێکی زۆری هەیە و بە بەربلاوی بەکاردەهێنرێت. ئەم فرمانەش **بە زیادکردنی پاشگرەکانی (-n/-In/-Il) بۆ سەر ڕەگی فرمانەکان(فرمانی کارا) دروست دەبێت** بەم شێوەیە:

١- فرمانی کۆتایی هاتوو بە پیتی دەنگی (a/ı/o/u/e/i/ö/ü) **پاشگری (-n)**ی دەخرێتە سەر.

| Ünlü ile biten fiiller + -n | | | |
|---|---|---|---|
| **فرمانی بکەر نادیار<br>Edilgen F.** | **فرمانی کارا<br>Etken F.** | **فرمانی بکەر نادیار<br>Edilgen F.** | **فرمانی کارا<br>Etken F.** |
| Koru**n**-<br>پارێزران | Koru-<br>پاراستن | Oku**n**-<br>خوێنران | Oku-<br>خوێندنەوە |
| İste**n**-<br>ویستران | İste-<br>ویستن | Başla**n**-<br>دەست پێکران | Başla-<br>دەست پێکردن |
| Özle**n**-<br>بیرکران | Özle-<br>بیرکردن | Ara**n**-<br>پەیوەندی کران | Ara-<br>پەیوەندی کردن |

٢- فرمانی کۆتایی هاتوو بەپیتی (L) **پاشگری (-ın/-in/-un/-ün)**ی دەخرێتە سەر.

| L ile biten fiiller + -ın/-in/-un/-ün | | | |
|---|---|---|---|
| **فرمانی بکەر نادیار Edilgen F.** | **فرمانی کارا Etken F.** | **فرمانی بکەر نادیار Edilgen F.** | **فرمانی کارا Etken F.** |
| Gül**ün-** هێنرانە پێکەنین | Gül- پێکەنین | Sil**in-** سڕانەوە | Sil- سڕینەوە |
| Bil**in-** زانران | Bil- زانین | Gel**in-** هێنران | Gel- هاتن |
| Bul**un-** دۆزرانەوە | Bul- دۆزینەوە | Al**ın-** کڕدران | Al- کڕین |

٣- فرمانی کۆتایی هاتوو بە پیتی نەبزوێن **پاشگری (-ıl/-il/-ul/-ül)**ی دەخرێتە سەر.

| Ünsüz ile biten fiiller + -ıl/-il/-ul/-ül | | | |
|---|---|---|---|
| فرمانی بکەر نادیار **Edilgen F.** | **فرمانی کارا Etken F.** | **فرمانی بکەر نادیار Edilgen F.** | **فرمانی کارا Etken F.** |
| Unut**ul-** لەبیرکران | Unut- لەبیرکردن | Öğret**il-** فێرکران | Öğret- فێرکردن |
| Tad**ıl-** تام کران | Tat- تام کردن | Duy**ul-** بیستران | Duy- بیستن |
| Sev**il-** خۆشویستران | Sev- خۆشویستن | Döv**ül-** لێدران | Döv- لێدان |

<u>تێبینی:</u>

١- فرمانی کارای (**Anla-**) حاڵەتێکی شازەو لەکاتی کردنی بە بکەر نادیار( Edilgen F.) دەبێتە (**Anlaşıl-**).

٢- هەر سێ فرمانی (-Ye) و (-De) و (-Yaşa) شازن، دەتوانرێ بە دوو شێوە بکرێنە فرمانی بکەر نادیار و هەردوو جۆرە پاشگری (-n) و (-nIl) وەردەگرن و لەڕووی ماناوە هیچ جیاوازیان نیە.

| Ye-<br>خواردن | Yen-<br>خوران | Yenil-<br>خوران |
|---|---|---|
| De-<br>گووتن | Den-<br>گووتران | Denil-<br>گووتران |
| Yaşa-<br>ژیان | Yaşan-<br>ژیێنران | Yaşanıl-<br>ژیێنران |

٣- فرمانەکان دوای ئەوەی دەبنە بکەر نادیار(Edilgen F.) دەبنە فرمانێکی نوێی سەربەخۆ و دەتوانن هەموو جۆرە پاشگرەکانی زەمەن(Zaman ekleri) و شێوازەکان(Kip ekleri) وەربگرن وەك هەر فرمانێکی تر.

| Yapılıyor | Yapılır | Yapılacak | Yapılmış |
|---|---|---|---|
| Yapıldı | Yapılırsa | Yapılan | Yapılırken |
| Yapıldıysa | Yapılmaz | Yapılmak | Yapılmalı |

٤- فرمانی بکەر نادیار(Edilgen F.) **لە ڕستەدا دەبێتە دوو جۆر: بکەر نادیاری بێ بکەر** (Öznesiz Edilgen F.) و **بکەر نادیاری بکەردار**(Özneli Edilgen F.).

جۆری یەکەم (Öznesiz Edilgen F.): **ڕستەکە هیچ بکەرێك(Özne)ی نیە و کەس نازانێ کێ ئەنجامی داوە.**

| ڕستەی بکەر نادیار<br>Öznesiz Edilgen cümle | ڕستەی فرمان کارا<br>Etken Cümle |
|---|---|

| Kitaplar okundu.<br>کتێبەکان خوێنرانەوە. | Kitapları okuduk.<br>(ئێمە) کتێبەکانمان خوێندەوە. |
|---|---|
| Otubüse binildi.<br>سواری پاس کرا. | Otobüse bindiler.<br>(ئەوان) سواری پاس بوون. |
| Kapı çalınıdı.<br>لە دەرگا درا. | Ali kapıyı çaldı.<br>عەلی لە دەرگاکە دەدات. |
| Hasta ameliyat ediliyor.<br>نەخۆشەکە عەمەلیات دەکرێ. | Doktor hastayı amaliyat ediyor.<br>دکتۆر نەخۆشەکە عەمەلیات دەکات. |
| Tüm ödevler yapıldı.<br>هەموو ئەرکەکان کران. | Tüm ödevleri yaptınız.<br>(ئێوە) هەموو ئەرکەکانتان کردووە. |

جۆری دووەم (Özneli Edilgen F.): **ڕستەکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بکەر(Özne)ی هەیە ئەویش لەڕێگای (CA-) و (tarafından)**. بۆ نمونە (پارەکە لەلایەن باوکمەوە درا)، لێرەدا فرمانی (**درا**) بکەر نادیارە بەڵام ڕستەکە بکەری هەیە کە (**باوکم**)ە. ئەمەش بەکارهێنانێکی گرنگەو لە نووسینی ئەکادیمی زۆر بەکاردەهێنرێت.

| **Özne + -ca/-ce/-ça/-çe …..+ edilgen fiil.** |
|---|
| **Özne + tarafından …..+ edilgen fiil.** |

**پاشگری (CA-) تەنها بۆ بکەرێك دەبێت کە کۆ** بێت وەك دەستە و تاقم و کۆمەڵە و...هتد، هەرچی (**tarafından**)ە **بۆ هەموو بکەرێکی تاك و کۆ دەبێت**.

| **بەراوردکاری (Karşılaştırma)** |
|---|
| Postacı mektubu **getirdi**. (Etken)<br>پۆستەچی نامەکەی هێنا. (کارا) |
| Mektup **getirildi**. (Öznesiz Edilgen F.)<br>نامەکە هێنرا. (بکەر نادیاری بێ بکەر) |
| Postacı tarafından mektup **getirildi**. (Özneli Edilgen F.) |

| لەلایەن پۆستەچیەوە نامەکە هێنرا. (بکەر نادیاری بکەردار) |
|---|

| |
|---|
| YTB tarafından burs ver**il**ir.<br>لەلایەن (YTB)ەوە سکۆڵەرشیپ دەدرێت. |
| Sınıfça pikniğe gitmeye karar ver**il**di.<br>بە پۆل بڕیاری چوونە سەیران درا. |
| Sınıf tarafından pikniğe gitmeye karar ver**il**di.<br>لەلایەن پۆلەکەوە بڕیاری چوونە سەیران درا. |
| Valilik tarafından fakirlere yardım ed**il**iyor.<br>لەلایەن پارێزگاوە یارمەتی هەژاران دەدرێت. |
| Bu park mahallelice temizle**n**ecek.<br>ئەو پاڕکە بە گەڕەك پاك دەکرێتەوە. |
| Müdür tarafından mesaj geldi.<br>لەلایەن بەڕێوەبەرەوە نامە هات. |

٥- فرمـــانی بکـــەر نادیـــار (Edilgen Fiil) بەهـــەردوو جـــۆری (Özneli) و (Öznesiz)ەوە بەهیچ شێوەیەك جێناوە کەسیەکان وەرناگرن (ئەگـەر فرمـانێکی شـێوە بکەر نادیارمان بینی جێناوی کەسیی لەسەر بـوو ئـەوە فرمـانی خۆسـەری- Dönüşlü Fiil-ە کە دوای ئەمە دەخوێنرێت.

## C- فرمانی خۆسەریی (Dönüşlü Fiil)

**ئەو کارەیە کە کەسێك یان شتێك ئەنجامی دەدات و کاریگەری کارەکەش تەنها بۆ سەر خودی بکەرەکە دەگەڕێتەوە**، بۆیە لەو جۆرە ڕستەیەدا حەتمەن دەبێ بکەر(Özne) هەبێت.

بۆ دروست کردنی فرمانی خۆسەریی(Dönüşlü Fiil) لە ڕەگی فرمانەکان ئەم سێ پاشگرە بەکاردێت **(-n/-In) (-Il) (-Iş)**، بەڵام چۆنیەتی زیادکردنی ئەوپاشگرانە بۆ سەر ڕەگی فرمانەکان یاسایەکی جێگیری نیە و پێویستی بە پڕاکتکیك و ئەزموونکاریە.

| **Fiil + -n / -In** | | | |
|---|---|---|---|
| **فرمانی خۆسەریی**<br>**.Dönüşlü F** | **فرمانی کارا**<br>**.Etken F** | **فرمانی خۆسەریی**<br>**.Dönüşlü F** | **فرمانی کارا**<br>**.Etken F** |
| Gör**ün**-<br>دەرکەوتن | Gör-<br>بینین | Besle**n**-<br>دەرخواردران | Besle-<br>دەرخوارددان |
| Sev**in**-<br>پێ خۆش بوون | Sev-<br>خۆشویستن | Gizle**n**-<br>خۆ شاردنەوە | Gizle-<br>شاردنەوە |
| Kaşı**n**-<br>خوران | Kaşı-<br>خوراندن | Döv**ün**-<br>بەرکەوتن | Döv-<br>لێدان |
| Koru**n**-<br>خۆپاراستن | Koru-<br>پاراستن | Taşı**n**-<br>خۆگواستنەوە | Taşı-<br>گواستنەوە |
| **Fiil + -Il (ıl,il,ul,ül)** | | | |
| **فرمانی خۆسەریی**<br>**.Dönüşlü F** | **فرمانی کارا**<br>**.Etken F** | **فرمانی خۆسەریی**<br>**.Dönüşlü F** | **فرمانی کارا**<br>**.Etken F** |
| Tak**ıl**-<br>بەستران | Tak-<br>بەستن | Yık**ıl**-<br>ڕووخان | Yık-<br>ڕووخاندن |
| Sars**ıl**- | Sars- | Devr**il**- | Devir- |

| هەڵگەڕاندنەوە | هەڵگەڕانەوە | هەژاندن | هەژان |
|---|---|---|---|
| Savur-<br>بەبادان | Sav**rul**-<br>بەباچوون | Ayır-<br>جیاکردنەوە | Ayr**ıl**-<br>جیابوونەوە |
| Kıvır-<br>لوول کردن | Kıvr**ıl**-<br>لوول بوون | Aç-<br>کردنەوە | Aç**ıl**-<br>کرانەوە |
| **Fiil + -Iş** | | | |
| **Dönüşlü F. فرمانی خۆسەریی** | | | |
| Geli**ş**-<br>پێشکەوتن | Yapı**ş**-<br>پێکەوە لکان | Yılı**ş**-<br>خۆخۆشەویست کردن | Kırı**ş**-<br>چرچ بوون |
| Ol**uş**-<br>پێگەیشتن | Yanaş-<br>لیَ نزیك بوونەوە | Uy**uş**-<br>گونجان | Kam**aş**-<br>شەوارەبوون |

تێبینی:

١- هەندێ فرمان هەن خۆیان لەڕووی مانـاوە خۆسـەرین (Dönüşlü) و پێویسـت بـەو پاشگرانە ناکەن، وەك:

| Doğ- | لەدایك بوون | Mutlu ol- | دڵخۆش بوون |
|---|---|---|---|
| Öl- | مردن | Büyü- | گەورەبوون |
| Hasta ol- | نەخۆش کەوتن | Küçül- | بچووك بوونەوە |

٢- فرمانەکان دوای ئەوەی دەبنە فرمانی خۆسـەریی(.Dönüşlü F) دەبنـە فرمـانێکی نـوێی سـەربەخۆ و دەتـوانن هـەموو جـۆرە پاشـگرەکانی زەمـەن(Zaman ekleri) و شێوازەکان(Kip ekleri) وەربگرن وەك هەر فرمانێکی تر.

| Taşını**yor** | Taşın**ır** | Taşın**acak** | Taşın**mış** |
|---|---|---|---|
| Taşın**dı** | Taşın**ırsa** | Taşın**an** | Taşın**ırken** |

| Taşın**dıysa** | Taşın**maz** | Taşın**mak** | Taşın**malı** |
|---|---|---|---|

**٣- فرمانی بکەر نادیار(Edilgen F.) و فرمانی خۆسەریی(Dönüşlü F.) لەڕووی پێکهاتنەوە لە هەردوو پاشگری (In-) و (Il-)دا هاوبەشن و زۆر لەیەك دەچن، بەڵام لەڕووی ماناوە جیاوازن.** لەنێو ڕستەدا دەتوانین بەم خاڵانەی خوارەوە لەیەکتریان جیابکەینەوە:

یەکەم/ فرمانی بکەر نادیار(Edilgen F.) بکەری نیە و نازانرێ کێ ئەنجامی داوە. بەڵام لە فرمانی خۆسەریی(Dönüşlü F.)دا حەتمەن دەبێ بکەرێك هەر هەبێت (جا ئاشکرابێت یان شاراوە) کە کارێکی کردووەو دەرەنجامەکەشی بۆ سەر خۆی گەڕاوەتەوە.

دووەم/ بۆ جیاکردنەوەی فرمانی خۆسەریی(Dönüşlü F.) لە فرمانی بکەرنادیاری بکەردار(Özneli Edilgen F.)، ئەوا فرمانی خۆسەریی(Dönüşlü F.) دەتوانێ جێناوە کەسیەکان وەربگرێت، کەچی فرمانە بکەر نادیارەکان(Özneli Edilgen F.) بەهیچ جۆرێك ناتوانن جێناوە کەسیەکان وەربگرن، لەلایەکی ترەوە ( Özneli Edilgen F.) هەمیشە پێویستی بە (tarafından/-CA) دەبێت و دەتوانین لەو ڕێگایەوە بزانین ئەوە فرمانی بکەر نادیارە.

| **فرمانی خۆسەریی (Dönüşlü Fiil)** |
|---|
| Ben yıka**n**dı<u>m</u>.<br>من خۆم شووشت. |
| Sen gizle**n**di<u>n</u>.<br>تۆ خۆت شاردەوە. |
| Onlar Batman’a taşı**n**dı<u>lar</u>.<br>ئەوان گواستیانەوە بۆ باتمان. |

| Her yerde <u>güneş</u> görü**n**üyor.<br>خۆر لە هەموو شوێنێك دەردەکەوێت. |
|---|
| **(Edilgen Fiil) فرمانی بکەر نادیار** |
| Bulaşıklar yıka**n**dı.<br>قاپ و قاچاخەکان شۆردران. |
| Orada her şey yapı**lı**yor.<br>لەوێدا هەموو شتێك دەکرێت. |
| Ali <u>tarafından</u> bulaşıklar yıka**n**dı.<br>قاپەکان لەلایەن عەلیەوە شۆردران. |
| Her yerde güneş gör**ül**üyor.<br>لەهەموو شوێنێك خۆر دەبینرێت. |

| **(Karşılaştırma) بەراوردکاری** |
|---|
| Ali sınıfı süsledi. (Etken)<br>عەلی پۆلەکەی ڕازاندەوە. |
| Sınıf süsle**n**di. (Öznesiz Edilgen F.)<br>پۆلەکە ڕازێنرایەوە. |
| Ali <u>tarafından</u> sınıf süsle**n**di.(Özneli Edilgen F.)<br>پۆلەکە لەلایەن عەلیەوە ڕازێنرایەوە. |
| <u>Ali</u> parti için süsle**n**di. (Dönüşlü F.)<br>عەلی بۆ ئاهەنگ خۆی ڕازاندەوە. |

## (İşteş Fiil) فرمانی هاوبەش - D

**بریتیە لەو فرمانەی کە بەهاوبەشی و بەیەکەوە یان بەشێوەی بەرامبەرکانێ دەکرێت.** ئەو جۆرە فرمانە دەتوانرێت لە ناو(İsim) و ڕەگی فرمان(Fiil) دروست بکرێت، دوای ئەوەی پاشگری (**-laş/-ş/-Iş**)دەچنە سەر ناو و فرمان، فرمانی هاوبەش(İşteş Fiil) دروست دەکەن دەبنە دوو گروپ و بە دوو مانا دێن.

| **İsim + -lAş** |
|---|
| **Fiil + -ş /-Iş** |

یەکەم/ **بە مانای بەیەکەوە ئەنجام دان** (Birlikte):

| Gül**üş**-<br>بەیەکەوە پێکەنین | Koş**uş**-<br>بەیەکەوە ڕاکردن | Öt**üş**-<br>بەیەکەوە جریواندن |
|---|---|---|
| Sakin**leş**-<br>یەکتر هێور کردنەوە | Oynaş-<br>بەیەکەوە یاری کردن | Döv**üş**-<br>لەیەکتری دان |
| Anla**ş**-<br>ڕێککەوتن | Uy**uş**-<br>بەیەکەوە گونجان | Vur**uş**-<br>لەیەکتری دان |
| | | Uç**uş**-<br>بەیەکەوە فڕین |

دووەم/ **بە مانای بەرامبەرکانێ** (Karşılıklı):

| Hesap**laş**-<br>حیساب لەگەڵ یەك کردن | Dert**leş**-<br>دەردەدڵی کردن | Selam**laş**-<br>سلاو لەیەکترکردن |
|---|---|---|
| Teyit**leş**-<br>پاڵپشتی یەکتری کردن | Bağır**ış**-<br>بەسەریەك هاوارکردن | Mesaj**laş**-<br>نامە بۆ یەکترناردن |

| Tehdit**leş**-<br>هەڕەشە لەیەکتری کردن | Sevi**ş**-<br>یەکتری خۆشویستن | Haber**leş**-<br>هەواڵ بەیەکتردان |
|---|---|---|
| Eş**leş**-<br>بەیەك گەیاندن | Toka**laş**-<br>تەوقە لەگەڵ یەك کردن | Tebrik**leş**-<br>پیرۆزبایی لەیەکترکردن |
| Gör**üş**-<br>یەکتر بینین | Karşıla**ş**-<br>ڕووبەڕووبوونەوە | Telefon**laş**-<br>تەلەفۆن بۆ یەکترکردن |
| Tanı**ş**-<br>یەکتر ناسین | Hediye**leş**-<br>دیاری بە یەکتردان | Söz**leş**-<br>پەیمان بەستن |
| | Kucak**laş**-<br>باوەش بەیەکدا کردن | Öpü**leş**-<br>یەکتر ماچ کردن |

تێبینی: هەندێ فرمان هەن وەك (**İyileş-**) و (**Kötüleş-**) و (**Gerçekleş-**) ئەوانە بە قاڵب بوونەو بوونەتە فرمانی سەربەخۆ و پەیوەندیان بە فرمانی هاوبەش(İşteş F.)ەوە نیە چونکە بەیەکەوە بوون و بەرامبەرکانێی تێدا نیە.

## E- فرمانی پێ کردن (Ettirgen Fiil)

**کەسێك یان شتێك کارێك بە کەسێکی تر یان شتێکی تر دەکات، یانیش کارێك دەکات کە کاریگەریی کارەکە لەسەر کەسێکی دیکە یان شتێکی دیکە دەردەکەوێت.** لەڕووی دروست بوونیشەوە بەهەرسێ پاشگری (**-Ir/-Dır/-t**) دروست دەبێت و لەنێویاندا فرمانی شازی زۆر بەرچاو دەکەون.

**١- فرمانی کۆتایی هاتوو بە پیتی نەبزوێن زۆربەی کات پاشگری (-dır/-dir/-dur/-dür/-tır/-tir/-tur/-tür) وەردەگرێت، کەمێکیشیان کە شازن پاشگری (-ır/-ir/-ur/-ür) وەردەگرن.**

**٢- فرمانی کۆتایی هاتوو بە پیتی دەنگی پاشگری (-t) وەردەگرن.**

| **Fiil + -Dır** | | | |
|---|---|---|---|
| **فرمانی کارا**<br>**Etken F.** | **فرمانی پێ کردن**<br>**Ettirgen F.** | **فرمانی کارا**<br>**Etken F.** | **فرمانی پێ کردن**<br>**Ettirgen F.** |
| Aç-<br>کردنەوە | Aç**tır**-<br>پێ کردنەوە | İyileş-<br>باش بوون | İyileş**tir**-<br>باش کردن |
| Değiş-<br>گۆڕان | Değiş**tir**-<br>گۆڕین | Kan-<br>خەڵەتان | Kan**dır**-<br>خەڵەتاندن |
| Bık-<br>بێزاربوون | Bık**tır**-<br>بێزارکردن | Öl-<br>مردن | Öl**dür**-<br>کوشتن |
| Dol-<br>پڕبوون | Dol**dur**-<br>پڕکردن | Oluş-<br>دروست بوون | Oluş**tur**-<br>دروست کردن |
| **Fiil + -Ir** | | | |
| **فرمانی کارا**<br>**Etken F.** | **فرمانی پێ کردن**<br>**Ettirgen F.** | **فرمانی کارا**<br>**Etken F.** | **فرمانی پێ کردن**<br>**Ettirgen F.** |
| Art-<br>زیادبوون | Art**ır**-<br>زیادکردن | Yat-<br>پاڵدانەوە | Yat**ır**-<br>پاڵکەواندن |
| Bat-<br>نقوم بوون | Bat**ır**-<br>نقوم کردن | Piş-<br>کوڵان | Piş**ir**-<br>کوڵاندن |
| Bit-<br>تەواو بوون | Bit**ir**-<br>تەواو کردن | Doy-<br>تێر بوون | Doy**ur**-<br>تێرکردن |
| Geç- | Geç**ir**- | İç- | İç**ir**- |

| تێپەڕین | تێپەڕاندن | خواردنەوە | پێ خواردنەوە |
|---|---|---|---|
| **Fiil + -t** | | | |
| **فرمانی کارا**<br>**Etken F.** | **فرمانی پێ کردن**<br>**Ettirgen F.** | **فرمانی کارا**<br>**Etken F.** | **فرمانی پێ کردن**<br>**Ettirgen F.** |
| Ağla-<br>گریان | Ağla**t-**<br>گریاندن | Büyü-<br>گەورەبوون | Büyü**t-**<br>گەورەکردن |
| Azal-<br>کەم بوونەوە | Azal**t-**<br>کەم کردنەوە | Oku-<br>خوێندنەوە | Oku**t-**<br>پێ خوێندنەوە |
| Ayır-<br>جیابوونەوە | Ayır**t-**<br>جیاکردنەوە | Uyu-<br>خەوتن | Uyu**t-**<br>خەواندن |
| Benze-<br>لێك چوون | Benze**t-**<br>بەیەك چواندن | Bekle-<br>چاوەڕێ کردن | Bekle**t-**<br>خستنە چاوەڕوانی |

تێبینی:

١- **هەر فرمانێك دەتوانێ تا سێ جار بەسەر یەکەوە پاشگری فرمانی پێ کردن(Ettirgen F.) وەربگرێت**، واتە سێ کەس کاریان بەیەکتر کردووە، ئەمەش لەڕێگای هەردوو پاشگری (**-t**) و (**-DIr**) بەدوای یەکدا دەبێت، چونکە نابێت دووجار بەدوای یەك (-DIrDIr/-tt) بێت.

| Araştır- | Araştır**t-** |
|---|---|
| Otur- | Otur**t-** |
| Gönder- | Gönder**t-** |
| Temizle- | Temizle**t-** |
| Temizlet- | Temizle**ttir-** |
| Temizlettir- | Temizle**ttirt-** |

| Temizle- (١ özne) | Kadın evi temizliyor. |
|---|---|

| | ژنەکە ماڵەکە پاك دەکاتەوە. |
|---|---|
| Temizle**t**- (٢ özne) | Kadın evi temizle**t**iyor.<br>ژنەکە ماڵەکە (بەکەسێك) پاك دەکاتەوە. |
| Temizle**ttir**- (٣ özne) | Kadın evi temizle**ttir**iyor.<br>ژنەکە (بەکەسێکی گوتوە ماڵەکە پاك بکاتەوە ئەویش بە کەسێکی تری) پاك دەکاتەوە. |
| Temizle**ttirt**- (٤ özne) | Kadın evi temizle**ttirt**iyor.<br>ژنەکە (بەکەسێکی گوتوە ماڵەکە پاك بکاتەوە ئەویش بە کەسێکی تری گووتوە ئەم کەسەی سێیەم بە کەسێکی تری) پاك دەکاتەوە. |

- چەند نمونەیەك لە فرمانی کار پێ کردن (Ettirgen Fiil) لە ڕستەدا:

- (Ayakkabımı değiş**tir**dim) واتە: پێڵاوەکانم گۆڕی. لەو ڕستەیەدا بکەرەکە (من)ە کارێکی کردووە کە کاریگەریەکەی لەسەر (پێڵاوەکە) دەرکەوتووەو گۆڕیویەتی.

- (Spor insanı zayıfla**t**ıyor) واتە: وەرزش مرۆڤ لاواز دەکات. بکەرەکە (وەرزش)ە، کاریگەری کارەکەشی لەسەر (مرۆڤ) دەردەکەوێت.

- (Babam bana ayakkabısını değiş**tirt**ti) واتە: باوکم پێڵاوەکانی پێ گۆڕیم. لەو ڕستەیەدا دوو بکەر هەن (باوکم و من) باوکم کارەکەی بەمن کردووە.

- (Ali ev ödevini kardeşine yap**tır**ıyor) واتە: عەلی ئەرکی ماڵەوەی بە براکەی دەکات. دوو بکەر هەن (عەلی و براکەی)، عەلی کارەکە بە براکەی دەکات.

- (Can mektuplarını babasına yaz**dır**ıyor) واتە: جان نامەکانی بە باوکی دەنووسێت. دوو بکەر هەن (جان و باوکی)، جان کارەکە بە باوکی دەکات.

- (Ayşe saçlarını annesine taraṯıyor) واتە: ئایشە قژی بە دایکــی دادێنێــت. دوو بکەر هەن (ئایشە و دایکی)، ئایشە کارەکە بە دایکی دەکات.

- دوو تێبینی گشتی دەربارەی بونیادی فرمانەکان (Fiillerde Çatı):

١- ئەگەر لە فرمانێکدا چەند پاشگرێکی جیــاوازی بونیــادی فرمــان(Fiillerde Çatı) بەیەکەوە کۆبوونەوە ئەوا هەمیشە بەم شێوەیە ڕیــز دەکــرێن: ســەرەتا پاشــگری فرمــانی خۆسەریی(**Dönüşlü fiil**)دێت، پاشان پاشگری فرمانی هاوبــەش(**İşteş Fiil**) دێــت، پاشان پاشگری فرمانی کار پێ کردن(**Ettirgen Fiil**) دێت، هەرچی پاشــگری فرمــانی بکەر نادیار(**Edilgen Fiil**)ە هەموو کات دەکەوێتە کۆتایی.

| Ol-uş-tur-ul | دروست کران | Fiil + Dönüşlü + Ettirgen + Edilgen |
|---|---|---|
| Giy-in-dir-il | پێ لەبەرکران | Fiil + Dönüşlü + Ettirgen + Edilgen |
| Tut-uş-tur | بەیەکتر گرتن | Fiil + İşteş + Ettirgen |
| Tan-ış-tır | بەیەکتر ناساندن | Fiil + İşteş + Ettirgen |

٢- ڕەگی فرمانەکان دوای وەرگرتنی پاشــگرەکانی بونیــادی فرمــان(Fiillerde Çatı) دەبنــە فرمــانێکی نــوێی ســەربەخۆ و توانــای وەرگرتنــی هــەموو ئــەو پاشــگرو ئەرکــە ڕێزمانیانەیان هەیە کە ڕەگی فرمان وەریان دەگرێت.

| Taşın**ıyor** | Taşın**ır** | Taşın**acak** | Taşın**mış** |
|---|---|---|---|
| Taşın**an** | Taşın**ırken** | Taşın**dıysa** | Taşın**maz** |
| Taşın**dı** | Taşın**ırsa** | Taşın**mak** | Taşın**malı** |

- نمونەی هەر پێنج پاشگرەکەی بونیادی فرمانەکان لەسەر یەك فرمان:

| Etken Fiil | Gör- | بینین |
|---|---|---|
| Edilgen Fiil | Gör**ül**- | بینران |
| Dönüşlü Fiil | Gör**ün**- | وا دەرکەوتن |
| İşteş Fiil | Gör**üş**- | یەکتر بینین |
| Ettirgen Fiil | Gör**dür**- | پێ بینین |

- دروست کردنی ناو لە فرمان، فرمان لە ناو

یەکەم/ **دروست کردنی فرمان لە ناودا** (İsimden Fiil Yapım Ekleri):

| **İsim + -al/-el/-ıl/-il/-ul/-ül/-l** | | | |
|---|---|---|---|
| Düzel- | Çoğal- | Daral- | Azal- |
| Bunal- | Eğril- | Doğrul- | İncel- |
| **İsim + -la/-le (-n/-t/-ş)** | | | |
| Selamla- | Sapla- | Yalanla- | İğnele- |
| Azarla- | Patla- | Gümle- | Tamamla- |
| Başla- | Gözle- | Sırtla- | Yuvarla- |
| Tuzla- | Kararla- | Akla- | Planla- |
| Hoşlan- | Evlen- | Aydınlat- | Birleş- |
| **İsim + -ar/-er** | | | |
| Morar- | Sarar- | Karar- | Kızar- |
| Başar- | Onar- | Yaşar- | Öner- |

دووەم/ **دروست كردنى ناو له فرماندا** (Fiilden İsim Yapım Ekleri):

| **Fiil + -mak/-mek** | | | |
|---|---|---|---|
| Okumak | Çalışmak | Gülmek | Çakmak |
| Gelmek | Koşmak | Üzülmek | Dökmek |
| **Fiil + -ma/-me** | | | |
| Toplama | Çarpma | Bölme | Okuma |
| Yazma | Basma | Kızartma | Görüşme |
| **Fiil + -ış/-iş/-uş/-üş** | | | |
| Geliş | Gidiş | Duruş | Çıkış |
| Giriş | Bakış | Bekleyiş | İniş |
| **Fiil + -m/-ım/-im/-um/-üm** | | | |
| Doğum | Ölüm | Kullanım | Alım |
| Kurum | Giyim | Tutam | Bilim |
| **Fiil + -k/-ık/-ik/-uk/-ük** | | | |
| Açık | Delik | Bozuk | Kırık |
| Yıkık | Atık | Tanık | Kopuk |
| **Fiil + -gı/-gi/-gu/-gü/-kı/-ki/-ku/-kü** | | | |
| Çılgı | Burgu | Salgı | Bitki |
| Dolgu | Tepki | Sevgi | Görgü |
| **Fiil + -gın/-gin/-gun/-gün/-kın/-kin/-kun/-kün** | | | |
| Durgun | Azgın | Coşkun | Pişkin |
| Solgun | Uygun | Taşkın | Şaşkın |
| **Fiil + -gan/-gen/-kan/-ken** | | | |
| Alıngan | Çekingen | Çalışkan | Unutkan |
| Somurtkan | Isırgan | Sıkılgan | Saldırgan |
| **Fiil + -ıcı/-ici/-ucu/-ücü** | | | |
| Akıcı | Delici | Bölücü | İnandırcı |
| Verici | Vurucu | Belirleyici | Mutlu edici |

- فرمانی لێکدراو (Birleşik Fiiller)

**١- توانین و نەتوانین (Yeterlilik Fiili)**: بریتیە لە پاشگری (**Abil/-A-**) کە دەچنە سەر فرمان و **مانای توانین و نەتوانینی پێ دەبەخشن** (لەبەشەکانی پێشوودا خوێنراوە).

| | |
|---|---|
| Yap**abil**irim. | دەتوانم بکەم |
| Yap**a**mam. | ناتوانم بکەم |

**٢- دەم و دەست (Tezlik Fiili)**: لەڕێگای پاشگری (**Iver-**) دەبێت، دەچێتە سەر فرمان و **مانای بەخێرایی و دەم و دەست ئەنجامدان دەداتە فرمانەکە**. بەگشتی لەگەڵ (Emir kipi) و (İstek kipi) بەکاردێت، بەتایبەتی کاتێ ئەم ووشانە هەبن (Hemen, birdenbire, aniden, ansızın).

| Bana su getir**iver**.<br>(دەم و دەست) ئاوم بدەرێ. |
|---|
| Tahtayı sil**iver**ir misin?<br>(دەم و دەست) تەختەکە دەسڕیتەوە. |
| Kedi arabanın önünde geç**iver**di.<br>پشیلەکە (بەخێرایی) بەپێش ئۆتۆمبێلەکە تێپەڕی. |
| Odamızı toplay**ıver**elim.<br>با (خێرا) ژوورەکەمان کۆبکەینەوە. |

**٣- بەردەوامی (Sürerlik Fiili)**: لەڕێگای پاشگرەکانی ( **-A kal/-A dur/-A gel**) ەوە دەچێتە سەر فرمان و **مانای بەردەوامێتی پێ دەبەخشێت**. بەڵام ئەو پاشگرانە یاسایەکی جێگیر و دیاریان نیە بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانیان بۆیە دەوەستێتە سەر پراکتیك و ئەزموون.

| Annesini görünce **donakal**dı.<br>دوای بینینی دایکی واقی وڕما. |
|---|
| Siz ödevi yap**adur**un.<br>ئێوە بەردەوام بن لە کردنی ئەرکەکانتان. |
| Siz kompozisyonları yaz**adur**un.<br>ئێوە بەردەوام بن لە نووسینی داڕشتنەکان. |

تێبینی: ووشەی (**Çıkagel**) لەڕووی ڕێزمانەوە شێوەی بەردەوامی هەیە، بەڵام لەڕووی ماناوە واتای (خێرا ئەنجامدان)ی هەیە.

**٤- نزيك بوونەوە (Yaklaşma)**: پاشگرەکەی (**A yaz-**)ەو دەچێتە سەر فرمان، بە **مانای نزيك بوونەوە لە ڕوودانی شتێ، خەريك بوو ڕوو بدات دێت.**

| |
|---|
| Kayak yaparken düş**eyaz**dım.<br>لەکاتی خليسکانێ لەسەر بەربوونەوە بووم. |
| Kayak yaparken düş**ecektim**.<br>لەکاتی خليسکانێ بەردەبوومەوە (بەڵام). |
| Kayak yaparken düş**mek üzere**ydim.<br>لەکاتی خليسکانێ لەسەر بەربوونەوە بووم. |
| Kayak yaparken **az kalsın** düşecektim.<br>لەکاتی خليسکانێ کەمێکی مابوو بەرببمەوە. |

- ڕەگەزەکانی ڕستە (Cümlenin Ögeleri)

بەگشتی لە ڕستەی زمانی تورکيدا ٤ جۆرە ڕەگەز هەيە:

A- بکەر/نيهاد (Özne).

B- بەرکار (Nesne).

C- کار/گوزارە (Yüklem).

D- تەواوکەر (Tümleç).

- ڕستەش دوو جۆری سەرەکی هەيە:

يەکەم- **ڕستەی ڕێك** (Kurallı -düzenli- Cümle): **بريتيە لەو ڕستەيەی کە ڕەگەزەکانی بەڕيزبەندی بەدوای يەکتردا هاتوون و پاش و پێشيان تێدا نيە** و بەگوێرەی ئەم ياسايەی خوارەوە داڕژاوە.

**Özne + Nesne / Tümleç + Yüklem.**

| **Ben yurda gidiyorum.** | |
|---|---|
| Ben | Özne |
| Yurda | Nesne |
| Gidiyorum | Yüklem |
| **Ben bu şiiri yazıyorum.** | |
| Ben | Özne |
| Bu Şiiri | Nesne |
| Yazıyorum | Yüklem |

دووەم- **ڕستەی ناڕێك** (Kuralsız -düzensiz- Cümle): **بریتیە لەو ڕستەیەی کە پاش و پێشی لە ڕیزبەندی ڕەگەزەکاندا هەیە و بەگشتی کار/گوزارە (Yüklem) ناکەوێتە کۆتایی ڕستە**، ئەم جۆرە ڕستانەش لە دەقە ئەدەبی و شیعریەکاندا زۆر بەرچاو دەکەوێت.

| **Yurda gidiyorum ben.** | |
|---|---|
| Yurda | Nesne |
| Gidiyorum | Yüklem |
| Ben | Özne |
| **Ben yazıyorum bu şiiri.** | |
| Ben | Özne |
| Yazıyorum | Yüklem |
| Bu Şiiri | Nesne |

A- بکەر/نیهاد (**Özne**): یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکیەکانی ڕستە و لەسەر بنەمای دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی لە ڕستەدا دەبێتە **سێ** جۆر:

یەکەم/ بکەر دیار (**Açık Özne**): لێرەدا ئۆزنەکە بە ڕوون و ڕاشکاوی دیارە.

| **Ben** spor yapıyorum. |
|---|
| **Sen** çok fazla konuştun. |
| **Ali** karısıyla kaçmış. |
| **Biz** gitmeyelim kalalım. |

دووەم/ بکەر شاراوە (**Gizli Özne**): لێرەدا ئۆزنە بوونی هەیە بەڵام شاراوەیە و لەڕێگای جێناوە کەسییەکانەوە دەتوانین بزانین ئۆزنەکە چ کەسێکە.

| Yemek yiyemedi**m.** | Ben |
|---|---|
| Benimle hiç uymaz**sın.** | Sen |
| Her zaman yalan söyler. | O |
| Dışarı çıktı**lar**. | Onlar |

سێیەم/ بکەر نادیار (**Sözde Özne**): لێرەدا ئۆزنە بوونی نیە و نازانرێت کێ کارەکەی ئەنجام داوە.

| Dolaptaki sütler içildi. | ! |
|---|---|
| Mektup yazılmış. | ! |
| Yeni sonuç elde edindi. | ! |
| Binalar yıkılıyor. | ! |

تێبینی:

١- ئەگەر Özne تاك بێت ئەوا Yüklem یش تاك دەبێت.

| |
|---|
| Ben de sizinle geldim.<br>منیش لەگەڵ ئێوە هاتم. |
| Irak askeri Musul’a girdi.<br>سەربازی عێراقی چوونە نێو موسڵ. |
| Ali eve dönecek.<br>عەلی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ. |

٢- لە کەسی سێەمی کۆ (**Onlar**)دا فرمانی ڕستەکە دەتوانرێ پاشگری (**-lar/-ler**)ی بخرێتە سەر و دەشتوانرێ بەبێ پاشگری (-lar/-ler) بنووسرێت. بەڵام ئەگەر (Onlar) لە ڕستەکەدا وەك بکەری شاراوە (**Gizli Özne**) هاتبوو ئەوا پێویستە پاشگری (**-lar/-ler**) بنووسرێت **بۆ ئەوەی لەگەڵ کەسی سێیەمی تاك (O) تێکەڵ نەبێت و کەسی بەرامبەر بزانێ بکەرەکە (Onlar)**ە.

| | |
|---|---|
| Hoca**lar** bize geliyor. | مامۆستاکان دێن بۆ لای ئێمە. |
| Bize geliyor**lar**. | دێن بۆ لای ئێمە. (ئەوان) |
| Türk**ler** çok çay içer. | تورکەکان زۆر چای دەخۆنەوە. |
| Çok çay içer**ler**. | زۆر چای دەخۆنەوە. (ئەوان) |

٣- ئەگەر Özne مرۆڤ نەبێت هەرچەندە کۆش بێت دەبێ Yüklem تاك بێت.

| | |
|---|---|
| Telefon**lar** kayboldu. | تەلەفۆنەکان وون بوون. |
| Okul**lar** kapanmış. | قوتابخانەکان داخران. |
| Çiçek**ler** soldu. | گوڵەکان سیس بوون. |
| Köpek**ler** öldü. | سەگەکان مردن. |

٤- ئەگەر Özne ناوی دەستە و کۆمەڵ بێت دەبێ Yüklem تاك بێت.

| | |
|---|---|
| Sınıf pikniğe giiti. | پۆلەکە چوونە سەیران. |
| Okul tatile giriyor. | قوتابخانە دەچێتە پشووەوە. |
| Irak sıcaktan yanar. | عێراق لە گەرما دەسوتێ. |
| Bakanlık taşınıyor. | وەزارەت دەگوازرێتەوە. |

٥- ئەگەر Özne جێناوی ناڕوونی (Belirsizlik Zamiri) بێت دەبێ Yüklem تاك بێت.

| | |
|---|---|
| Hiç kimse sınıfa girmemiş. | هیچ کەسێك نەهاتە پۆل. |
| Herkes gülüyor. | هەموان پێ دەکەنن. |
| Bazıları çok tembel. | هەندێکیان زۆر تەمبەڵن. |

B- کار/گوزارە (**Yüklem**): **ڕەگەزی سەرەکی ڕستەیە و بەبێ بوونی Yüklem ڕستە دروست نابێت**. لەرستەی فرمانیدا دەبێتە کار، لەڕستەی ناویشدا دەبێتە گوزارە، بەڵام

لــەزمانی تورکیــدا بەهــەردووکیان دەگووترێــت Yüklem، بــەهۆی Yüklemیشــەوە دەتوانین Özneی ڕستەکە بدۆزینەوە.

C- بەرکار (**Nesne**): ئەو شتەیە کە کاری تێدەکرێت و بــەبێ بــەرکار(Nesne)مانــای ڕستەکە تەواو نابێت. بەرکار(Nesne) لەگــەڵ فرمــانی تێپــەڕ (Geçişli Fiil) دێــت، بەرکار(Nesne)ش دوو جۆری هەیە:

١- بەرکاری نەناســراو -گشــتی- (**Belirtisiz Nesne**): بریتیــە لــەو بــەرکارەی کــە نەناسراوەو وەڵامی هەردوو پرسیاری (Kim?) و (Ne?) یە.

| | |
|---|---|
| Ben ٢ kilo **elma** aldım. | من دوو کیلۆ سێوم کڕی. |
| Dün beraber **yemek** yedik. | دوێنێ بەیەکەوە نانمان خوارد. |
| Her gün **sunucu** konuşacak. | هەموو ڕۆژێك پێشکەشکار قسە دەکات. |
| Kerkük'te **kitap** satıyordum. | لە کەرکوك کتێبم دەفرۆشت. |

٢- بەرکاری ناسراو -تایبەت- (**Belirtili Nesne**): بریتیە لەو بەرکارەی کە ناســراوو دیارە و وەڵامی هەردوو پرسیاری (Kimi?) و (Neyi?) یە.

| |
|---|
| Ben ٢ kilo **elmayı** marketten aldım.<br>من دوو کیلۆ سێوەکەم لە مارکێتەکە کڕی. |
| Dün beraber **dolmayı** yedik.<br>دوێنێ بەیەکەوە دۆڵمەکەمان خوارد. |
| Her gün **Ali** konuşacak.<br>هەموو ڕۆژێك عەلی قسە دەکات. |
| Kerkük'te **kitaplarımı** satıyordum.<br>لە کەرکوك کتێبەکانی خۆمم دەفرۆشت. |

D- تەواوکەر (**Tümleç**): دوو جۆری هەیە تەواوکەری زەرفی(Zarf Tümleci) و تەواوکەری ناڕاستەوخۆ(Dolaylı Tümleci).

١- تەواوکەری زەرفی (**Zarf Tümleci**): وەڵامی ئەو پرسیارانە لە ڕستەدا دەبنە تەواوکەری زەرفی.

Nasıl? / Ne zaman? / Neden? / Niçin? / Niye? / Kime göre? / Neye göre? / Ne kadar? / Ne ile?

| | | |
|---|---|---|
| İki ay önce Ali ١٠ bin Tl kazanmış. | İki ay önce | Zarf tümleci |
| | Ali | Özne |
| | ١٠ bin Tl | Belirtisiz nesne |
| | Kazanmış | Yüklem |
| Para kazanmak için ABD’ye gitti. | Para kazanmak için | Zarf tümleci |
| | ABD’ye | Dolaylı tümleci |
| | Gitti | Yüklem |
| Ali yarın ülkesine dönecek. | Ali | Özne |
| | Yarın | Zarf tümleci |
| | Ülkesine | Dolaylı tümleci |
| | Dönecek | Yüklem |

٢- تەواوکەری ناڕاستەوخۆ(**Dolaylı Tümleci**): ئەو پاشگرە حاڵیانەی خوارەوە کاتێ بچنە سەر ناوێك ئەوا بەیەکەوە دەبنە تەواوکەری ناڕاستەوخۆ.

| | |
|---|---|
| Yönelme hali eki | -a/-e |
| Bulunma hali eki | -da/-de/-ta/-te |
| Ayrılma hali eki | -dan/-den/-tan/-ten |

| | | |
|---|---|---|
| Ben geçen ay | Ben | Özne |

| | Geçen ay | Zarf tümleci |
|---|---|---|
| | Irak'tan | Dolaylı tümleci |
| | Geldim | Yüklem |
| Ali uzun bir müdddet Kayseri'de yaşadı. | Ali | Özne |
| | Uzun bir müdddet | Zarf tümleci |
| | Kayseri'de | Dolaylı tümleci |
| | Yaşadı | Yüklem |
| Biz İstanbul'a gitmek istiyoruz. | Biz | Özne |
| | İstanbul'a | Dolaylı tümleci |
| | Gitmek | Belirtisiz nesne |
| | Istiyoruz | Yüklem |

تێبینی: هەندێ جار پاشگرەکانی (-a/-e) و (-dan/-den/-tan/-ten) بەمانای حـاڵی نایەن و مانای تر دەگەیەنن لەو حاڵەتانەدا نابنــە تەواوکــەری ناڕاســتەوخۆ بــەڵکو دەبنــە تەواوکەری زەرفی.

| | |
|---|---|
| Çay **içmeye** gideceğiz. (Ne için?)<br>بۆ چاخواردنەوە دەچین. | Zarf tümleci |
| **Yağmurdan dolayı** ıslandık. (Neden?)<br>بەهۆی بارانەوە تەڕبووین. | Zarf tümleci |
| **Birazdan** teneffüs yapacağız. (Ne zaman)<br>کەمێکی تر ڕێست وەردەگرین. | Zarf tümleci |

- ووشەگەل (Sözcükler)

ووشەکان لە زمانی تورکیدا دەبنە دوو بەشی سەرەکی:

| ئەرکدار (Görevliler) | مانادار (Anlamlar) |
|---|---|
| Edat | Fiil |
| Bağlaç | İsim |
| Ünler | Sıfat |
| | Zamir |
| | Zarf |

بەشی یەکەم/ ووشە ماناداره‌کان(Anlamlar) بـریتین لـە: فرمـان(Fiil)، نـاو(İsim)، سیفات(Sıfat)، جێناو(Zamir)، زەرف(Zarf)، لە بەشەکانی پێشوودا باس کراون.

بەشـی دووەم/ ووشـە ئەرکـدارەکان(Görevliler) بـریتین لـە: ئامرازەکـان(Edat)، بەستەرەکان(Bağlaç)، دەنگەکان(Ünler)، لەبەشەکانی پێشوودا لێرەو لـەوێ کـەمێك باسکراون، لێرەدا بە ووردی دەیانخەینەڕوو.

## A- ئامرازەکان(Edatlar)

ئامرازەکان لەهەموو زمانێکدا گرنگی تایبـەتی خۆیـان هەیـە و بەشـێوەیەکی بـەرفراوان بەکاردەهێنرێن، گرنگترین ئامرازەکانی زمانی تورکیش بریتین لەمانە:

### ١- هی، سەربە، عاید...(-A ait)

مانای **خاوەنـدارێتی**(Sahiplik) و **موڵکایـەتی**(Mülkiyet) دەگەیـەنێت، هەمیشـە پاشگری حاڵی (**-a**/**-e**) لەپێشی دێت.

| Bu kalem ban**a ait**.<br>ئەوە پێنووسە هی منە. |
|---|
| Okul**a ait** bir bilgisayar var.<br>کۆمپیوتەرێکی سەربە قوتابخانە هەیە |
| Bu araba Ali'y**e ait**.<br>ئەو ئۆتۆمبێلە هی عەلیە. |

| Bu kitap ban**a ait**.<br>ئەو کتێبە هی منە. |
|---|

## ٢- هەتا، تا، بەقەدەر (-A kadar / -A dek)

| | |
|---|---|
| Bugün öğleye **kadar** uyudum. | ئەمرۆ تا نیوەڕۆ خەوتم. |
| İstanbul'**a dek** trenle gideriz. | تا ئیستەنبوڵ بە شەمەندەفەر دەڕۆین. |
| Sınıfta ١٥ **kadar** öğrenci var. | لەپۆلدا هەتا ١٥ قوتابی هەن. |
| Günde ٣ saat **kadar** çalışırım. | لەڕۆژێکدا تا ٣ کاتژمێر دەخوێنم. |
| Ali, Aso **kadar** uzun boylu değil. | عەلی بەقەدەر ئاسۆ بالاّ بەرز نیە. |
| Yarın**a dek** seni bekliyorum. | تا بەیانی چاوەڕێی تۆ دەکەم. |

## ٣- سەرباری، سەرەڕای (-A rağmen / -A karşın).

| **İsim + -A ragmen/-A karşın** |
|---|
| **Fiil + -mA + şahıs eki + -A ragmen/-A karşın** |
| Kar yağ**masına rağmen** piknik yaptık.<br>سەرباری بەفر بارین سەیرانمان کرد. |
| ١٢ saat uyu**mama karşın** hala esniyorum.<br>سەرباری ١٢ کاتژمێر خەوتنم هێشتا باوێشك دەدەمەوە. |
| Fakir ol**mana rağmen** para savuruyorsun.<br>سەرباری هەژار بوونت پارە بەفیڕۆ دەدەی. |

| Her gün spor yap**malarına karşın** şişmanlıyorlar.<br>سەرباری هەموو ڕۆژێك وەرزش كردنیان قەڵەو دەبن. |
|---|
| ٦ aydır iş ara**masına rağmen** iş bulamaz.<br>سەرباری ئەوەی ٦ مانگە بەدوای كاردا دەگەڕێت كار نادۆزێتەوە. |

- هەروەها (Fiil + -DIk + iyelik eki + halde) هەمان واتای سەرەوەی دەدات.

| Üşü**düğü halde** mont giymemiş.<br>چاكەتی لەبەرنەكردووە لەكاتێكدا سەرمایەتی. |
|---|
| Gel**mediği halde** yalan da söyler.<br>لەحاڵێكدا كە نەهاتووە درۆش دەكات. |
| Katıl**dığım halde** hiç hatırlamıyorum.<br>هیچم بەبیرنایەتەوە لەكاتێكدا بەشداربوومە. |

٤- بەرەو، نزیك، سەرلە (-A doğru / -A karşı)

| Çocuk park**a doğru** koştu. | منداڵەکە بەرەو پارك ڕایکرد. |
|---|---|
| Dağ**a doğru** yola düştük. | بەرەو چیاکە بەڕێ کەوتین. |
| Seçim**e doğru** gidiyoruz. | بەرەو هەڵبژاردن دەڕۆین. |
| Sabah**a doğru** evden çıkalım. | با سەر لەبەیانی لەماڵ دەربچین. |
| Akşam**a doğru** ulaşacaksın. | سەر لەئێوارە دەگەیتە جێ. |

## ٥- (-A göre)

بەسێ مانای جیاواز دێت بەگوێرەی دەرکەوتنی لە ڕستەدا کە بریتین لە (بەبڕوای...، ڕێك گونجاوە بۆ...، لەچاو...).

| Ban**a göre** hayat çok zor değil. | بەبڕوای من ژیان زۆر سەخت نیە. |
|---|---|
| Siz**e göre** ne yapacağım? | بەبڕوای ئێوە چی بکەم؟ |
| Bu ceket benim kardeşim**e göre**. | ئەو چاکێتە ڕێك بۆ براکەم گونجاوە. |
| Bu meslek san**a göre** değil. | ئەو پیشەیە بۆ تۆ گونجاو نیە. |
| Ali, Aso'y**e göre** daha zayıf. | عەلی لەچاو ئاسۆ لاوازترە. |
| Irak'**a göre** Türkiye gelişmiştir. | لەچاو عێراق تورکیا پێشکەوتووە. |
| Ney**e göre** zekat verilir? | زەکات بەگوێرەی چی دەدرێت؟ |

## ٦- وەك (Gibi)

| |
|---|
| Ali **gibi** mert bir erkek görmezsin.<br>پیاوێکی وەك عەلی مەرد نابینیت. |
| Babam **gibi** şefkatli bir adam yok.<br>پیاوێکی وەك باوکم میهرەبان بوونی نیە. |
| Benim **gibi** yapmak istiyor musun?<br>دەتەوێت وەك من بکەیت؟ |
| Ay **gibi** güzel bir kızdır.<br>کچێکی وەکو مانگ جوانە. |
| Patronumuz deli **gibi**ydi.<br>بەڕێوەبەرەکەمان وەك شێت وابوو. |

<u>تێبینی</u>: شێوازی بەقاڵب بووی (**Fiil+-mIş+gibi**) بەمانای (**وەك ئەوەی وابێ**) دێت و یەکێکە لە بەکارهێنانە گرنگەکان لە ئاخاوتنی تورکیدا.

| |
|---|
| Ali gör**memiş gibi** davranıyor.<br>عەلی وەك ئەوەی هیچی نەبینیبێ ڕەفتار دەکات. |
| Arabayı kendisinin**miş gibi** sürüyor.<br>وەك ئەوەی ئۆتۆمبێلەکە هی خۆی بێت لێی دەخوڕێت. |
| Aso bugün ağla**mış gibi** görünüyor.<br>ئاسۆ ئەمڕۆ وەك ئەوەی گریابێ دەردەکەوێت. |
| Fırındaki balıklar piş**miş gibi**dir.<br>ماسیەکانی نێو فڕن وەك ئەوەی کوڵابن وان. |
| Zengin**miş gibi** alışveriş yapar.<br>وەك ئەوەی دەوڵەمەند بێت بازاڕ دەکات. |

## ٧- گوایە (Güya / Sözüm ona)

| **Güya** Iraklıkar hepsi zenginmiş.<br>گوایە عێراقیەکان هەموویان دەوڵەمەندن. |
|---|
| **Sözüm ona** her ay ٥ bin Tl maaşım var.<br>گوایە هەموو مانگێك ٥ هەزار لیرە موچەم هەیە. |
| **Güya** ben tambel bir öğrenciyim.<br>گوایە من قوتابیەکی تەمبەڵم. |

## ٨- (İle)

بەگوێرەی دەرکەوتنی لە ڕستەدا سێ مانـای جیـاواز دەدات (**لەگـەڵ، بـە، وە**) (لـە ئاستەکانی پێشووتر بە ووردی باسکراوە).

| Aso, Ali **ile** beraber çalışıyor. | ئاسۆ لەگەڵ عەلی بەیەکەوە کار دەکەن. |
|---|---|
| Uçak**la** Türkiye'ye geldim. | بەفڕۆکە هاتمە تورکیا. |
| Runa **ile** Aynur çok güzel. | ڕوونە و ئاینوور زۆر جوانن. |
| Hocam**la** beraber geliriz. | لەگەڵ مامۆستاکەم بەیەکەوە دێین. |

لەکاتی شت کڕیندا ئەگەر بەشێوەزاری ئاخاوتنی خەڵك بلێـی (ئـەو شـتەم بەوەنـدە لـیرە کڕی) لەجیاتی (**ile**) (**-a/-e**) بـەکاردەهێنرێ. بـۆ نمونـە ( Bu kalemi beş liray**a** aldım) واتە ئەو پێنووسەم بە پێنج لیرە کڕی، یان (On liray**a**) واتە (بە ١٠ لیرە).

## ٩- تەنانەت، هەتتا (Bile / Hatta / Dahi)

| Sınıftaki kavgayı Hoca **bile** öğrendi.<br>تەنانەت مامۆستاش بەشەڕەکەی پۆلی زانی. |
| --- |
| Çok kızdı, **hatta** yemek de yemedi.<br>زۆر تورە بوو هەتا نانیشی نەخوارد. |
| O gün, beni **bile** dinlememiştin.<br>ئەو ڕۆژە تەنانەت گوێت لەمنیش نەگرتبوو. |
| En yakın arkadaşlarım **dahi** beni unuttu.<br>تەنانەت نزیکترین هاوڕێم منی لەبیر کرد. |

## ١٠- بۆ (İçin)

دەتوانێ لەڕستەدا چەندین ڕۆڵ بگێڕێت وەك بیروڕا(Fikir bildirme)، لەپێناو شتێ(Bir şeyin uğruna)، پەیوەست بە(İle ilgili)، هۆکار(Sebep)، ئامانج(Amaç).

| Benim **için** bu konular çok basit.<br>ئەو بابەتانە بۆ من زۆر سادەن. |
| --- |
| Onun **için** bu ders gereksiz sanırım.<br>پێم وایە ئەو وانەیە بۆ ئەو نا پێویستە. |
| Annem **için** çiçek topladım.<br>گوڵم بۆ دایکم چنی. |
| Babam benim **için** elinden geleni yaptı.<br>باوکم ئەوەی لەدەستی هات بۆ من کردی. |
| Benim **için** çok kötü sözler söyelmişti. |

| قسەی زۆر خراپی کردبوو دەرهەق بە من. |
|---|
| Yağmur yağdığı **için** ıslandık.<br>لەبەر باران بارین تەڕبووین. |
| Eğtim görmek **için** okula kaydolmalısın.<br>بۆ خوێندن دەبێ لە قوتابخانە تۆماربی. |

## ١١- تەنها، بەس (Ancak)

ئەم ئامرازە دوو مانای هەیە (**تەنها، بەس**) و (**بەڵام**)، ئەو کاتە دەبێتە ئامراز(Edat) کە بەمانای (تەنها، بەس) بێت.

| Bir yıl spor yaptım **ancak** ٣ kilo verdim.<br>ساڵێك وەرزشم کرد تەنها ٣ کیلۆم فڕێدا. |
|---|
| Bize **ancak** polis yardım edebilir.<br>تەنها پۆلیس دەتوانێ یارمەتی ئێمە بدات. |
| Piknikte **ancak** bir çay içebildik.<br>لەسەیراندا تەنها توانیمان یەك چای بخۆینەوە. |
| Çok çalışmasına rağmen **ancak** ٥٠ puan almış.<br>سەرباری زۆر خوێندنی تەنها ٥٠ نمرەی هێنا. |

## ١٢- دەڵێی، وەك بڵێی (Sanki / Adeta)

ئەم دوو ئامرازە بۆ سێ مەبەست بەکاردێت: **شتێك وا هەست دەکەی بەڵام لەڕاستیدا وانیە، ڕابواردن و گاڵتە پێ کردن، خەملاندن**.

| Kuşlar **sanki** konuşuyor. | باڵندەکان دەڵێی قسە دەکەن. |
|---|---|
| Çocuk ağlıyor, **sanki** acıkmış. | منداڵەکە دەگریت، دەڵێی برسیە. |
| **Adeta** sınıfın en zayıfı odur. | وەك بڵێی لاوازترین کەسی پۆلەکە ئەوە. |
| **Sanki** dışarıda biri var. | دەڵێی لە دەرەوە کەسێك هەیە. |
| **Adeta** bir şey söylemek ister. | دەڵێی دەیەوێت شتێك بڵێت. |

## ١٣- (-mAk üzere)

دوو مانا دەدات لە ڕستەدا، **نزیك بوونەوە**(Yaklaşma)، **بۆ** (Amaç, niyet).

| Biraz bekle eve gel**mek üzere**yim.<br>کەمێك چاوەڕێ بکە، لەسەر هاتنەوەم بۆماڵەوە. |
|---|
| Çok iyi olmuş iş bit**mek üzere**.<br>زۆر باش بوو کارەکە لەسەر تەواو بوونە. |
| Türkçe öğren**mek üzere** kitap okuyorum.<br>بۆ فێربوونی تورکی کتێب دەخوێنمەوە. |
| Seninle konuş**mak üzere** buraya geldim.<br>بۆ قسەکردن لەگەڵ تۆ هاتمە ئێرە. |

## ١٤- جگە لە(-DAn başka/-nIn dışında/-nIn haricinde)

| |
|---|
| Sen**den başka** bir dostum yok.<br>جگە لە تۆ دۆستێکی ترم نیە. |
| On**dan başka** bir tamirci tanırım.<br>جگە لەو وەستایەکی تر دەناسم. |
| Ben**im dışımda** bir Kürt burada var mı?<br>جگە لەمن کوردێکی تر هەیە لێرە؟ |
| Siz**in dışınızda** bir hocayla çalışmayız.<br>جگە لە ئێوە لەگەڵ مامۆستایەکی تر ناخوێنین. |
| Ali'**nin haricinde** herkes geçti.<br>جگە لە عەلی هەمووان دەرچوون. |
| Bulgur **haricinde** her şeyi yerim.<br>جگە لە ساوار هەموو شتێك دەخۆم. |

## ١٥- بەویشەوە (Dahil)

| |
|---|
| Ali **dahil** herkes seni seviyor.<br>هەموو کەسێك تۆی خۆش دەوێ بە عەلیشەوە. |
| Ben **dahil** hepimiz çalışmalıyız.<br>هەموومان دەبێ کار بکەین بەمنیشەوە. |
| ABD **dahil** her ülkede yoksulluk var.<br>لەهەموو وولاتێکدا هەژاریی هەیە بە ئەمەریکاشەوە. |

## ١٦- ئامرازەکانی بەهۆی

-DAn dolayı / -DAn ötürü / -mAsI nedeniyle / -mAsI sebebiyle / -mAsI sonucunda / -mAsI üzerine

| |
|---|
| Elektrik kesil**diğinden dolayı** ders yapamadık.<br>بەهۆی کارەبا بڕانەوە نەمانتوانی دەرس بخوێنین. |
| Hoca gel**mediğinden ötürü** ders yapamadık.<br>بەهۆی نەهاتنی مامۆستاوە نەمانتوانی دەرس بخوێنین. |
| Irak'ta kal**ması nedeniyle** Türkiye'e gelemez.<br>بەهۆی مانەوەی لە عێراق ناتوانێ بێتە تورکیا. |
| Ali gel**mesi sebebiyle** Aso gelmedi.<br>بەهۆی هاتنی عەلی ئاسۆ نەهات. |
| Seçim ol**ması sonucunda** çıkamadık.<br>لەئەنجامی هەبوونی هەڵبژاردن نەمانتوانی دەربچین. |
| Geç uyu**ması üzerine** geç kaldım.<br>بەهۆی درەنگ خەوتنەوە درەنگ کەوتم. |
| Geç uyu**dum diye** geç kaldım.<br>لەبەر ئەوەی درەنگ خەوتم درەنگ کەوتم. |

## B-بەستەرەکان(Bağlaçlar)

بریتین لەو ووشانەی کە دوو ڕستە بەیەکتر دەبەستنەوەو لــە هــەموو زمانێکـدا گرنگــی و بەکارهێنانی زۆریان هەیە. گرنگترین بەستەرەکانی زمانی تورکیش بریتین لەمانە:

### ١- بەڵام ( Ancak / Ama / Fakat / Lakin)

هەر چواریان هەمان مانایان هەیــە. بەســتەری (Ancak) دەبــێ مانــای (بــەڵام) بــدات تاوەکو ببێتە بەستەر(Bağlaç).

| Yurda gittim **ancak** müdürü bulamadım.<br>چوومە داخڵی بەڵام بەڕێوەبەرەکەم نەبینی. |
|---|
| Yeni bir gömlek aldım **ama** giymedim.<br>کراسێکی نوێم کڕی بەڵام نەمپۆشی. |
| Arabayı satarım **fakat** babam razı değil.<br>ئۆتۆمبێلەکە دەفرۆشم بەڵام باوکم ڕازی نیە. |
| Onun yanına gideceğim **lakin** utanıyorum<br>دەچمە لای ئەو بەڵام شەرم دەکەم. |

### ٢- چونکە (Çünkü)

| Sınavdan düşük puan aldım **çünkü** hiç çalışmadım.<br>لەتاقیکردنەوە نمرەیەکی نزمم هێنا چونکە هیچ نەمخوێند. |
|---|
| Seni seviyorum **çünkü** iyi bir insansın.<br>تۆم خۆش دەوێت چونکە مرۆڤێکی باشیت. |
| Erbil'e döneceğim **çünkü** annemi özlerim. |

## ٣- بەداخەوە (Ne yazık ki / Ne var ki / Maalesef)

| **Ne yazık ki** senin için hiçbir şey yapamam.<br>بەداخەوە ناتوانم هیچ شتێك بۆتۆ بکەم. |
|---|
| **Ne var ki** Aso size kızdı.<br>بەداخەوە ئاسۆ لێتان تووڕە بوو. |
| **Maalesef** dünyada savaş bitmez.<br>بەداخەوە شەڕ لە دونیا نابڕێتەوە. |
| **Ne yazık ki** seni yanlış tanıdım sanırım.<br>بەداخەوە پێم وابێ بەهەڵە تۆم ناسیووە. |

## ٤- خۆشبەختانە (İyi ki)

| **İyi ki** geldin çok sevindik.<br>خۆشبەختانە هاتیت زۆرمان پێ خۆش بوو. |
|---|
| Murat çok hastaymış **iyi ki** iyileşmiş.<br>موراد زۆر نەخۆش بوو خۆشبەختانە چاك بووەوە. |

## ٥- ئەوە چیە کە (Nedir ki)

**بۆ بچوك کردنەوەو بەچاوی نزم و بێ بایەخ تەماشاکردن بەکاردێت.**

| Araba **nedir ki** herkes alabilir.<br>ئۆتۆمبێل چیە کە هەموو کەسێك دەتوانێ بیکڕێت. |
|---|
| Zenginlik **nedir ki** önemli olan ahlaktır.<br>دەوڵەمەندێتی چیە گرنگ ڕەوشتە. |

### ٦- شکور بۆ خوا، خۆشبەختانە (Neyse ki)

| |
|---|
| **Neyse ki** kazayı hafif atlattık.<br>شکور بۆ خوا بەسوکی دەربازبووین لە ڕووداوەکە. |
| Param bitti **neyse ki** maaşım geldi.<br>پارەم تەواو بوو خۆشبەختانە مووچەکەم هات. |

تێبینی: ووشەی (Neyse) بەتەنها واتە (هەرچیەك بێت، بەهەر حاڵ).

### ٧- لەکاتێکدا، لەحاڵێکدا (Oysaki / Oysa / Halbuki)

| |
|---|
| Annemi kırdım **oysaki** onu kırmak istememiştim.<br>دڵی دایکمم شکاند لە کاتێکدا نەمدەویست دڵی بشکێنم. |
| Dileniyor **oysa** çok zengindir.<br>دەرۆزە دەکات لەکاتێکدا زۆر دەوڵەمەندە. |
| Onun için pasta yaptım, **halbuki** o şeker hastaymış.<br>کێکم بۆ ئەو دروست کرد، لەحاڵێکدا ئەو نەخۆشی شەکرەی هەبوو. |

### ٨- بەشێوەیەك کە (Öyle ki / Şöyle ki)

| |
|---|
| Çok üzgündü, **öyle ki** ağzından tek bir söz çıkmadı.<br>زۆر دڵتەنگ بوو، بەشێوەیەك کە یەك ووشە لە دەمی دەرنەچوو. |
| Yüzü sapsarı oldu, **öyle ki** ölecek zannettik.<br>ڕووی زەرد هەڵگەڕا، بەشێوەیەك کە گومانمان وابرد دەمرێت. |

## ٩- مادەم کە...ئەوکاتە (Mademki/Madem....O halde/O zaman)

| **Mademki** şişmansın **o halde** spor yap.<br>مادەم قەڵەویت ئەو کاتە وەرزش بکە. |
|---|
| **Mademki** dersten sıkıldın **o zaman** dışarı çık.<br>مادەم لە دەرس بێزاریت ئەو کاتە بڕۆ دەرەوە. |

## ١٠- کەواتە (Demek ki / Demek)

| Yerler ıslak **demek ki** yağmur yağmış.<br>زەوی تەڕە کەواتە باران باریووە. |
|---|
| Sınavdan ٥٠ puan almış, **demek ki** çalışmamış.<br>لە تاقیکردنەوە ٥٠ی هێناوە، کەواتە نەیخوێندووە. |

## ١١- لەگەڵ ئەوەش (Kaldı ki)

| Yarın randevum var **kaldı ki** çok hastayım.<br>بەیانی مەوعیدم هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆشم. |
|---|
| Çocukken çalışıyordum, **kaldı ki** okuldaydım.<br>کاتی منداڵی کارم دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا لە قوتابخانە بووم. |

١٢- گریمان، با وا دابنێین، با بڵـێین ( Tut ki / Varsayalım ki/ Diyelim ki / Farz edelim ki)

| |
|---|
| **Varsayalım ki** zenginsin, ne yapıyorsun?<br>با وا دابنێین کە دەوڵەمەندیت، چی دەکەیت؟ |
| **Diyelim ki** dresin yok, o zaman bizimle gelir miydin?<br>با بلێین دەرست نیە، ئەو کاتە لەگەڵمان دەهاتیت؟ |
| **Farz edelim ki** Türkçe kursu biter, daha da çalışmalısın.<br>با وای دابنێین کە کۆرسی تورکی تەواو دەبێت، دەبێ هێشتا بخوێنیت. |
| **Diyelim ki** geldik, neyi ikram ediyorsun?<br>بابلێین هاتین، چیمان پێشکەش دەکەیت؟ |

١٣- ئیللا، هەرچۆنێك بێت ( İllaki / İlla / Her halde / Her halükarda / Her durumda / Ne olursa olsun)

| |
|---|
| **İllaki** bu kitabı bitireceğiz.<br>(هەرچۆنێك بێت) ئیللا ئەو کتێبە تەواو دەکەین. |
| Bilet bulamıyorm, ama **her halde** ülkeme gideceğim.<br>بلیت نادۆزمەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت دەچمەوە وولاتەکەم. |
| Bahane yok **illa** gelirsin.<br>بەهانە ناخوات ئیللا دەهێیت. |
| **Ne olursa olsun** hep gülümse.<br>چی دەبێت بابێت، هەمیشە زەردەخەنە بکە. |
| **Her halükarda** kaybedersin.<br>هەرچۆنێك بێت دەدۆڕێیت. |

تێبینی: ووشەی (**Herhalde**) بەشێوەی لکاوی واتا لەوانەیە (Galiba).

## ١٤- (Ki)

یەکێکە لە گرنگترین و بەربلاوترین بەستەرەکانی زمانی تورکی و چەندین ئەرك و مانای جیاواز دەگەیەنێت.

| **بەمانای (کە)** |
|---|
| Ben **ki** hep sizin için çalıştım.<br>من کە هەر بۆ ئێوە کارم کردووە. |
| Aso **ki** senin en yakın arakadaşındır.<br>ئاسۆ کە نزیکترین هاوڕێی تۆیە. |
| **بەمانای (تا)** |
| Her gece süt içmelisin **ki** boyun uzasın.<br>دەبێ هەموو شەوێك شیر بخۆیتەوە تا باڵات بەرزبێت. |
| Ders çalış **ki** sınavı geçersin.<br>دەرس بخوێنە تا لە قوتابخانە دەربچیت. |
| **بەمانای (کە) فەرق پێ کردن** |
| Eve girdim **ki** kedi tüm koltukları parçalamıştı.<br>کە چوومەماڵەوە پشیلەکە قەنەفەکانی پارچە پارچە کردبوو. |
| Sınıfa girdim **ki** kimse yokmuş.<br>کە چوومە پۆلەوە کەسی لێ نەبوو. |
| **بەمانای بێ سنووری و لەحەد بەدەری** |
| Bana o kadar çok yardım ettiniz **ki**...<br>ئەوەندە یارمەتی منتان داوە کە... |

| Onu o kadar çok severim **ki**...<br>ئەوم هێندە زۆر خۆش دەوێ کە... |
|---|
| **بەمانای (بۆیە، دیارە کە)** |
| Bir şey biliyor **ki** konuşuyor.<br>دیارە شتێك دەزانێت قسە دەکات. |
| Yemek o kadar güzeldi **ki** hepsi bitti.<br>خواردنەکە ئەوەندە خۆش بوو بۆیە هەموو تەواو بوو. |
| **بەمانای (وا دەڵێت) (Diyor ki)** |
| Mevlana diyor **ki** "Cahil kişi gülün güzelliğini görmez, gider dikenine takılır"<br>مەولانا دەڵێت: کەسی نەزان جوانی گوڵ نابینێت، دەچێت خۆی بە دڕکەوە سەرقاڵ دەکات. |
| Erbekan diyor ki "Bir çiçekle bahar olmaz, ama her bahar bir çiçekle başlar"<br>ئەربەکان دەڵێت: بەهار بەیەك گوڵ نابێت، بەڵام هەموو بەهارێك بە گوڵێك دەست پێ دەکات. |
| **بەمانای (ئاخۆ)** |
| Bu sınavı kazanabilir miyim **ki**?<br>ئاخۆ لەو تاقیکردنەوەیە سەردەکەوم؟ |
| Beni seviyor mu **ki**?<br>ئاخۆ منی خۆش دەوێت؟ |
| **بەمانای (خۆ)** |
| Ona güvenilmez **ki**!<br>خۆ باوەڕی پێ ناکرێت! |
| O beni hiç dinlemez **ki**!<br>خۆ ئەو هیچ گوێی لەمن ناگرێ! |
| Beni kabul eder mi **ki**? |

| خۆ من قبوڵ دەکات؟ |
| --- |
| Benimle sinemaya gelir mi **ki**?<br>خۆ لەگەڵم دێتە سینەما؟ |
| **بەمانای پتەوکردنی سیفاتەکان** |
| Çirkin **ki** çirkin bir kız.<br>کچێکی ناشیرین ناشیرین. |
| Güzel **ki** güzel bir çocuk.<br>منداڵێکی جوان جوان. |

## ١٥- لەبەر ئەوەی، چونکە (Nitekim / Zira)

| Ömer hayvansever bir insandır, **nitekim** her sabah köpeklere yiyecek verir.<br>عومەر مرۆڤێکی ئاژەڵدۆستە، لەبەر ئەوەی هەموو بەیانیەك خواردن دەداتە سەگەکان. |
| --- |
| Runa merhemetlidir, **zira** nerede bir fakir görse yardım eder.<br>ڕوونە میهرەبانە، چونکە لەهەر کوێیەك هەژارێك ببینێت یارمەتی دەدات. |

- هەروەها (**Nitekim**) بەمانای **سەرەنجام** (Sonuç olarak / Sonuçta) دێت.

| ....**nitekim** yanlış yaptığını farketti.<br>...سەرەنجام کارە هەڵەکەی هەست پێ کرد. |
| --- |
| ....**nitekim** doğrusunu söyledi.<br>...سەرەنجام ڕاستیەکەی گووت. |

### ١٦- چما (Meğer / Meğerse)

| |
|---|
| Seni evde sandım **meğer** eve hiç gelmemişsin.<br>پێم وابوو لەماڵەوەیت، چما هیچ نەهاتیتەوە ماڵ. |
| Boşuna hazırlık yaptık **meğer** doğum günü bir ay sonraymış.<br>بەلاش ئامادەکاریمان کرد، چما ڕۆژی لەدایك بوونەکەی مانگێك دواتر بوو. |
| Sürekli yanlış yazıyordum **meğer** sorun klavyedeymiş.<br>بەردەوام هەڵەم دەنووسی، چما کێشە لە کیبۆردەکە بوو. |

### ١٧- یش ، دەبا، دە (dA)

| |
|---|
| Ben **de** o soruyu çözemedim.<br>منیش ئەو پرسیارەم پێ حەل نەکرا. |
| Eve döneyim **de** sonra onu arayım.<br>دەبا بگەڕێمەوە ماڵ پاشان پەیوەندی پێوە بکەم. |
| Okulunu bitirecek **de** araba alacak.<br>دەبا خوێندنەکەی تەواو بکات ئۆتۆمبێل دەکڕێت. |
| Kopya çekin **de** ben **de** size göstereyim.<br>دە ئێوە قۆپیە بکەن منیش پێتان نیشان دەدەم. |

### ١٨- یان، یانیش، یاخود (Veya / Ya da / Yahut)

| |
|---|
| Yakacak olarak odun **veya** kömür kullanabilirsiniz.<br>دەتوانن دار یان خەڵووز بەکاربێنن وەك سوتەمەنی. |
| Gir **ya da** çık; kapıda dikilme! |

| بڕۆ ژوورەوە یانیش دەرچوو، لەدەرگادا مەچەقە. |
|---|
| Yemeğin yanına pilav **yahut** makarna yapalım.<br>با لەتەك چێشتەکە پلاو یاخود مەعکەرۆنی لیٚ بنیٚین. |
| Bugün **ya da** yarın mutlaka gitmemiz gerekiyor.<br>ئەورۆ یان سبەی موتڵەقەن هەر دەبێت بڕۆین. |

١٩- جگە لەوەش، هەروەها (Ayrıca).

| Her akşam bu ilacı alın **ayrıca** diyetinize de dikkat edin.<br>هەموو ئێوارەیەك ئەو عیلاجانە وەرگرن جگە لەوەش ووریای ریجیمەکەشتان بن. |
|---|
| Telefona format atalım **ayrıca** pilini de değiştirelim.<br>با تەلەفۆنەکە فۆرمات بکەین، هەروەها پاتریەکەشی بگۆڕین. |
| Hava yağmurlu **ayrıca** kar yağma ihtimali de var.<br>هەوا باراناویە جگە لەوەش ئەگەری باران بارینیش هەیە. |

٢٠- دیسان (Yine / Gene).

| Acele et **yine** okula geç kalacaksın.<br>پەلە بکە دیسان لە قوتابخانە دوا دەکەویت. |
|---|
| Yine yanlış geldik!<br>دیسان بە هەڵە هاتین! |
| Camları boşuna silme **gene** yağmur yağabilir.<br>بەلاش جامەکان مەسڕەوە لەوانەیە دیسان باران ببارێت. |

## ٢١- هەم ... هەم (hem…hem de)

**بۆ دووشت و دوو کار بەکاردێت کە هەردووکیان بەیەکەوە کرابێت** (لە زمانی کوردیشدا هەمان بەستەرمان هەیە و بەهەمان مانا بەکاری دێنین).

| Gençlik yıllarımda **hem** okudum **hem de** çalıştım.<br>لە ساڵانی لاویمدا هەم خوێندم و هەم کاریشم کرد. |
|---|
| Istanbul'da **hem** gezdim **hem de** ticaret yaptım.<br>لە ئیستەنبوڵدا هەم گەڕام و هەم بازرگانیشم کرد. |
| Ahmet çok neşeli **hem** yemek yiyor **hem de** konuşuyor.<br>ئەحمەد زۆر سپۆرتە هەم نان دەخوات و هەم قسەش دەکات. |

## ٢٢- نە ... نە (ne...ne de)

**بۆ دووشت و دوو کار بەکاردێت کە هیچ کامێکیان نەکرابێت** (لە زمانی کوردیشدا هەمان بەستەرمان هەیە و بەهەمان مانا بەکاری دێنین).

| Gençlik yıllarımda **ne** okudum **ne de** çalıştım.<br>لە ساڵانی لاویمدا نە خوێندم و نە کاریشم کرد. |
|---|
| Istanbul'da **ne** gezdim **ne de** ticaret yaptım.<br>لە ئیستەنبوڵ نە گەڕام و نە بازرگانیشم کرد. |
| Ahmet hastaydı **ne** yemek yedi **ne de** konuştu.<br>ئەحمەد نەخۆش بوو نە نانی خوارد و نە قسەشی کرد. |

### ٢٣- یان ... یانیش (ya...ya da)

**بۆ دووشت و دوو کار بەکاردێت کە یەکێکیان ئەنجام بدرێت** (لە زمانی کوردیشدا هەمان بەستەرمان هەیە و بەهەمان مانا بەکاری دێنین).

| Gelecek yılda **ya** okuyacağım **ya da** çalışacağım.<br>ساڵی داهاتوودا یان دەخوێنم یان کار دەکەم. |
|---|
| Istanbul'da **ya** geziyorum **ya da** ticaret yapıyorum.<br>لە ئیستەنبوڵ یان دەگەڕێم یان بازرگانی دەکەم. |

### ٢٤- چ ئەوە چ ئەوە (gerek.... gerekse)

| Annem **gerek** sözleriyle **gerek** bakışlarıyla sevgi verir.<br>دایکم چ بە ووتەکانی بێت چ بە سەیرکردنەکانی خۆشەویستی دەبەخشێ. |
|---|
| **Gerek** rüzgar **gerekse** güneş, iyi birer enerji kaynağıdır.<br>چ با چ خۆر، دوو سەرچاوەی باشی ووزەن. |

### ٢٥- سەرباری ئەوەش (Üstelik)

| Rıfat Eravşar iyi bir hocaydı **üstelik** çok da kibardı.<br>رەفعەت ئێراڤشار مامۆستایەکی باش بوو سەرباری ئەوە زۆریش بەشەخسیەت بوو. |
|---|
| Pasta yapabiliyorum **üstelik** çiğ köfte de yapabiliyorum.<br>دەتوانم کێک دروست بکەم سەرباری ئەوە دەتوانم چی کۆفتەش دروست بکەم. |

## C- دەنگەکان(Ünlemler)

بریتین لەو ووشە زیادکراوانەی لە کاتی قسەکردندا دەردەبڕدرێن و بە تەنها هیچ مانایەکیان نیە. بۆ مەبەستی دەربڕینی سەرسوڕمان، تووڕە بوون، ترسان، ئازار، بێزاریی، بچوك کردنەوە، ڕازی بوون، ڕەتکردنەوە...هتد دەر دەبڕدرێت، وەك:

| Ya | Ya sabır!<br>خوایە سەبر! |
| --- | --- |
| Be | Git be!<br>دە بڕۆ دەی! |
| Eee | Eee! Ne yapıyorsunuz?<br>ئێی چی دەکەن؟ |
| Eyvah | Eyvah! Ev yanıyor.<br>ئەی هاوار! ماڵەکە دەسوتێ. |
| Ey | Ey Allahım.<br>ئەی خودام. |
| Hey | Hey! Gelir misin?<br>هێی دێیت؟ |
| Şşt | Şşt! Sus konuşma!<br>ششش بێ دەنگ قسە مەکە. |

تەواوبوونی نووسین: ٢٠١٨/٠٩/١٨ ، قەیسەری- تورکیا

# ناوەرۆك